کتێب: قەفەسی ئاسنین، یان بۆ بیمەوە بە عێراقی؟!

نووسەر: ڕێبوار سیوەیلی

بابەت: لێکۆڵینەوە

تیراژ: ۳۰۰۰

چاپی یەکەم: سلێمانی، چاپخانەی ڕەنج ۲۰۰۳

ژمارەی سپاردنی (۲٦۰)ی ساڵی ۲۰۰۳ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

ڕێبوار سیوەیلی

# قەفەسی ئاسنین

# یان

# بۆ ببمەوە بە عێراقی؟!

لێکۆڵینەوەیەک لەسەر «بەعەرەبکردن»، «بەئەویترکردن» و «بەدوژمنکردن»

لە ئەبو یەقزانەوە بۆ سەددام حسێن

کوردستان ٢٠٠٣

# پێرست

## پێشەکی

لە ئەدەبیاتی سیاسی و ئەکادیمی ئێمەدا زاراوەی «تەعریب» یان «بەعەرەبکردن» لە برەوسەندندایە و ئامانجیش لە بەکارهێنانی بەردەوامی ئەم زاراوەیە بریتیە لە پیشاندانی سیمای رژێمی بەعس وەکئەوی لە عێراق و کوردستاندا بەرجەستە بووە. لە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەدا هەمیشە ڕووخساری نێگەتیڤانەی ئەو رژێمە لەپێش چاو گیراوە، کە ڕووخسارێکی دیکتاتۆرانەی ستەمکارانەیەو بۆ ئەمەش پشت دەبەسترێ بە سەرژمێری و ناوهێنان و ئاماژەدان بەو شوێنە جوگرافیانەی کوردستان کە ئەو سیاسەتەیان بەسەردا سەپێنراوە و ئاسەوارگەلێکی فرە خراپیشی لەسەر ژیانی مرۆڤی کورد جێهێشتووە.

بێگومان بەکارهێنانی زاراوەی تەعریب، بەو مانایەی باسمانکرد، بەکارهێنانێکی نوێیە و لەو هەلومەرجە سیاسی و مێژووییانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە رژێمی بەعس لە عێراقدا سەپاندبوونی و زیاتر لەوەی هەڵگری ڕاستییەکی مێژوویی سەلمێنراو بێت، بەرچەکردارێکی فیکرییە لە ئاست ئەو دیاردەیەدا. واتە ئەگەر مانای تەعریب لە زمانی کوردیدا «بوون بەعەرەب و بەعەرەبکردن» بگەیەنێت، ئەوە بەم مانایە پرۆسەی بەعەرەبکردن وەک ئیمتیازێک وابووە کە لە سەدەکانی ناوەندەوە و بۆ یەکەمجار لە سەدەی هەشتەمی زاییندا لەلایەن نوسەرە عەرەبەکانەوە،

(بەمەبەستی دەستەمۆکردن وماڵیکردنیان) بەکورد دراوە.
ئەمەش بەو مانایەی لەو مێژووەوە کەمپانیایەکی عەرەبیانەی ئیسلامیانە لەسەر دەستی مێژوونووس، جوگرافیزان، گەڕیدە و نوسەرانی عەرەب خراوەتە گەڕ بەنیازی دۆزینەوە و دروستکردنی ڕەچەڵەکێکی عەرەبیانە بۆ کورد. لە پاشانیشدا و لە ئەنجامی برەوسەندن و بەهێزبوونی ئەم کەمپانیایە لە سەدەکانی پاشتردا، گوتارێکی هێندە پتەوی داڕشتووە کە ڕەتکردنەوەی، بەتایبەتی لەلایەن کورد خۆیەوە، ئاسان نەبووە و دەسەڵاتی ئەم گوتارە ئەوانیشی گرتۆتەوە. بەجۆرێ ئەمجارەیان کوردەکان خۆیان دەستپێشخەری دەکەن لەوەی (ئەسڵ و فەسڵ) و بنچەی خۆیان ببەنەوە سەر تیرە و تایفە و بنەماڵە عەرەبییەکان. لێرەشەوە گوتاری ناوبراو لە گوتارێکی دەستەمۆکەری دەرەکییەوە کە ئاراستەی کورد کراوە؛ دەگۆڕێ بۆ گوتارێک کە توێژە باڵاکانی کورد؛ لە پێناوی مانەوە و خۆگونجاندندا قەبوڵی دەکەن و ئیدی پرۆسەی بەعەرەبکردنیش دەگۆڕێ بۆ **خۆبەعەرەبکردن**. بەجۆرێ کە ئەمەی دوایان وەک ئیمتیازێکی لێدێت کە کورد هەوڵیداوە لە ڕێگەی شانازیکردن بە ڕەچەڵەکی عەرەبیانەی خۆیەوە، بەدەستی بهێنێ.

«تەعریبی بەعس»، بە پێچەوانەی بیروڕای باوی توێژەر و ئەکادیمی و سیاسییە کوردەکان و ڕاگەیاندنی ڕەسمیی کوردییەوە، بەهیچ شێوەیەک ناچێتە ناو ئەم

چوارچێوەیەوە و کارێکیش کە ڕژێمی بەعس لە عێراقدا کردوویەتی؛ نە بە مەبەستی ماڵیکردن و دەستەمۆکردنی کورد بووە (وەکئەوەی عەرەبە مسوڵمانەکانی سەرەتا هەوڵیان بۆ دەدا) و نە لە پێناوی ئەوەشدا کە ئیمتیازی بەعەرەبوونیان بداتێ تا شانازی بە ڕەچەڵکی خۆیانەوە بکەن (وەکئەوەی کوردەکان دەیانویست بیکەن). کارێک کە بەعس پرۆژەی بۆ دارشت و بەشێکی زۆریشی لێ بەئەنجامگەیاند، لە پرۆسەی بەعەرەبکردن و خۆبەعەرەبکردنی تێپەڕاند و هەردوو ئەو گوتارەی لە بناخەوە هەڵوەشاندەوە. ئەگەرچی چنینێکی هاوبەشیش هەیە لە نێوان بەعەرەبکردنی سەرەتا (کە شتێکی مەعنەوی بوو و زیاتریش لەسەر کاغەز بەرجەستە دەکرا) لەگەڵ کارێکدا کە بەعس لەسەر عەردی واقیع جێبەجێیکرد و دەکرێ لە ئێستادا ناوی بنێین بە «ئەویترکردن» و ئەمەش هەنگاوێکی سەرەکیی بوو بۆ بە «دوژمنکردن»ی کورد لە لایەن بەعسییەکانەوە تا ڕێگەی لەناوبردنیان خۆشبکات.

بۆیە ئەو خاڵەی من لەم باسەدا بەرگریی لێدەکەم ئەوەیە: بەعس، بەو مانا هاوچەرخەی لە لایەن کورد خۆیەوە بەکار دەهێنرێت، ئیمەی بە عەرەب نەکردووە؛ بەڵکو ئەمە ناونانێکی هەڵە و شێوێنەرە بۆ ئەو کارە و پێویستە تراژیدیای کوردی لە ستەمکاریی ئەو هێز و ڕاگەیاندن و سیاسی و ئەکادیمیە سادەبیرانە وەربگرینەوە، کە بیانەوێت و نەیانەوێت بەو ناولێنانە پۆزەتیڤانەیان لە پرۆژەی

بەعس، خزمەتێکی زۆر بە مانەوەی وێنەیەکی باش لەسەر ئەو ڕژێمە دەکەن. بێگومان ئەمەش سیمایەکی تری ئەو خۆبەعەرەبکردنە مێژووییەی کوردە و خەسڵەتێکی ئەو دەستەو گرووپانەیە کە بەدرێژایی دوازدەساڵ حوکمی خۆبەڕێوەبردنیش، نەیانتوانی و نەیانهێشت وێنەی دوژمنێکی ڕاستەقینە و دژ بە مانەوەی کورد وەک مرۆڤ، لەسەر ڕژێمی بەعس بهێنرێتە دی و تەنانەت بەکارهێنانی وشەی «بەعس»یشیان لەڕاگەیاندندا یاساخکردبوو..

بەر لەوەی بێمە سەر باسکردنی جەوهەری پرۆژەی بەعس لە عێراقدا، واتە پرۆژەی «بەئەویترکردن» وەک هەنگاوێک بۆ «بەدوژمنکردنی کورد»، سەرەتا بە کورتی و پوختی باس لە هەردوو پرۆسەی بەعەرەبکردن و خۆبەعەرەبکردن دەکەم و هەوڵدەدەم لەسەر هۆکارەکانیان بدوێم. ئەوەی مەبەستی منە ئەوەیە بزانم ئەم دوو پرۆسەیە چیدەڵێن و بکەرەکانیان چۆن بیریانکردۆتەوە و لە کوێدا ئەو بیرکردنەوەیەی ئەوان لە ئێستاشدا بەردەوامیی هەیە.

لە ڕووی میتۆدیەوە، هەوڵمداوە لە توێژینەوەی مێژووییەوە بەرەو شرۆڤەکردنی ئایدیاکانی ناو ئەو مێژووە و لەوێشەوە بۆ پرسیاری فەلسەفی لە خود و شوناسی خودی کوردی پەل بکێشم. بۆیە ئیشکردنی من ئەوەندەی بەکێشەکردنی نەبوونی خودی کوردیە لەناو مێژوودا، ئەوەندە گەڕان و ساخکردنەوەی ڕەچەڵەکدۆزیی کورد نییە. بەمانایەکی تر: ئەوەندەی من سەرقاڵی ئەو

ئایدیایانەم کە لەناو مێژوودا سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کورد بەرهەمهاتوون و ئاشکراکردنی ئەوەی لە ئێستادا چ ئەنجامێکیان بۆ خودی کوردی بەدەست هێناوە، ئەوەندە خەریکی بەرپەرچدانەوە و ساخکردنەوە و بەدرۆخستنەوەی ئەو ڕەچەڵەکە سەپێنراوانە نیم کە لە مێژوودا بۆ کورد بەرهەمهاتوون. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە من لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدوای کەشفکردنی بابەتێکی دەست لێنەدراوی مێژوویدا نەڕۆیشتووم، بەڵکو سەرلەنوێ ئەو بابەتەی کە پێشتر ئاشکرا کراوە، لەڕوانگەی ئێستاوە تەئویل دەکەمەوە و گەرەکمە بۆ تێگەیشتن لە هەنووکە سوودی لێوەربگرم.

ئەگەر خوێنەر فیلمی (نەخۆشە ئینگلیزەکە: *The English patient*)ی بینیبێت[1]، بێگومان ئەو دیمەنەی لە یادە کە تیایدا (کاترینا) بەدیار ئاگرەکەوە چیرۆکی ئەو پیاوە دەگێڕێتەوە کە ناچار بووە فەرماندەکەی خۆی بکوژێت. کاترینا ئەم چیرۆکەی لە کتێبی ***مێژووی*** (هیرۆدت)ی یۆنانییەوە وەرگرتووە و بۆیەش دەیگێڕێتەوە تا بەهۆیەوە لە ژیان و سەردەمی خۆی تێبگات و دووبارە تەئویلی بکاتەوە. وەلێ لەو فیلمەدا کتێبەکەی هیرۆدۆت بۆ نەخۆشە ئینگلیزەکە (گرێف ئالماسی) ڕابەرێکی بێ نموونەی گومان لێنەکراوە و هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەیگێڕێت و بە کەشفکردن و

[1] Den engeliske patient, Lindhardt og Ringhof, 1997, p 25.

سەرنجەکانی خۆی دەوڵەمەندی دەکات. ئەم دوو مرۆڤە هەردووکیان بە دوو شێوەی جیاواز مێژوو دەخوێننەوە: کاترینا بەمەبەستی ئەوەی زیاتر بە ئێستای خۆی و سەردەمەکەیدا ڕۆچێت و پەیوەندییەکی هەنووکەیی لەگەڵدا چێبکات. بەڵام نەخۆشە ئینگلیزەکە بەمەبەستی دوورکەوتنەوە لە ئێستا، خۆی لەناو کتێب و بەسەرهات و حەکایەتە مێژووییەکاندا نغرۆ دەکا و هەر ئەوەش دەبێتە چارەنووسی بەبێ ئەوەی لە ئێستای سەردەمەکەی خۆی تێبگات.

ڕەوتی مێژوونووسی لە وڵاتی ئێمەدا، پتر مامەڵەکردنە لەگەڵ مێژوو بەو جۆرەی نەخۆشە ئینگلیزەکە دەیکات. لەکاتێکدا ئێمە پێویستیمان بەوەی دووەمیانە. هیوادارم ئەم نامیلکەیە هەنگاوێک بێت بەو ئاراستەیەدا.

سەرەتا ئەم باسە لە کۆڕێکی (بنکەی کاوەی ڕۆشنبیری) لە هەولێر و پاشانیش لە کۆڕێکی زانکۆی سلێمانیدا پێشکەشکرا و کەسانێکی زۆر سەرنج و ڕەخنەی جیدیان لێگرتم. وێڕای سووپاسم بۆ هەموو ئەو کەسانە، هیوادارم ڕەنگدانەوەی ڕەخنەکانیان لەم دەقەی ئێستادا ببیننەوە. لەگەڵ ئەوشدا ئەمکارە بەم شێوەیەی ئێستای مەیسەر نەدەبوو ئەگەر هەریەک لە هاوڕێیانم: *جەبار جەمال غەریب*، *موسڵح ئیروانی*، *مراد* حەکیم و بەتایبەتیش *حەیدەر لەشکری* بەسەرنجی ڕەخنەگرانەی خۆیان بابەتەکەیان دەوڵەمەند نەکردبا... سووپاسی یەکبەیەکیان دەکەم.

## یەکەم: بەعەرەبکردنی کورد

وەک ئاماژەم پێدا، پرۆسەی بەعەرەبکردن کەمپانیایەکی عەرەبیانەی ئیسلامیانەیە و لە سەدەی هەشتەمی زایینییەوە و لەسەر دەستی مێژوونووس، جوگرافیزان، گەڕیدە و نووسەرانی عەرەب، بەمەبەستی سازدان و دروستکردنی ڕەچەڵەکێکی عەرەبیانە بۆ کورد، خراوەتەگەڕ. یەکەمین کەسێ لەمبارەیەوە دوابێت سەحیم کوڕی حەفس ناسراو بە «ئەبو یەقزان ۱۹۰ کۆچی/۸۰۵ ـ ۸۰۶ی زایینی»ە کە دەبێت لە چەند نووسراوێکی بێسەروشوێنیدا یاداشتی کردبێت و پاشانیش نوسەرانی دیکەی پاش ئەو هەمان شتیان دووبارە کردبێتەوە. بە بڕوای ئەبو یەقزان دەبێت «**باپیرە هەرەگەورەی کوردان کوردی کوڕی عەمری کوڕی عامری کوڕی سەعسەعە**» بێت[2].

ئەم ڕەچەڵەک دانەپاڵەی ئەبو یەقزان، بەهەندێ گۆڕانکارییەوە لەلایەن کەسانی ترەوە، لەوانەش مێژوونووسی بەناوبانگ «مەسعودی» دووبارە کراونەتەوە.

---

[2] ئارشاک پۆلادیان: ***کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا***. وەرگێڕانی: ئازاد عوبێد ساڵح. چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ۲۰۰۰، ل ۱۵۳.

مەسعودی لە بەرهەمێکیدا نوسیویە: «**هەندێک لە کوردانی پاشتر، لە شارەزاکانیان ـ ئەوانەیان کە ئێمە لەو وڵاتانەی ناومان هێنان و بینیومانن ـ لەسەر ئەوە دەڕۆن کە ئەوان لە بنەچەی کوردی کوڕی مەردی کوڕی سەعسەعەی کوڕی حەربی کوڕی هەوازنن**»[3]. بێگومان ئەم بیروڕایانە و ئەوەکانی پاشتریش هەموویان لە دژی بەرژەوەندی کوردەکان بوون و هەوڵدانێکی شێلگیر بوون بۆ دروستکردنی قەفەسێکی ئاسنین کە پاشان کوردیش بۆخۆی لەسەر دەستی میر و سەرداران و پادشاکانی، لەوانەش ئەییوبییەکان، بووە نێچیرێکی ناوی و هاتنە سەر ئەو بڕوایەی نکوڵی لە عەرەبوونی خۆیان نەکەن[4]. میر و پادشا و خاوەن بنەماڵەکانی کورد دوای ئەوەی لە پانتایی عەرەبی ـ ئیسلامیدا دەستەمۆ و خۆماڵی دەکرێن، هەوڵدەدەن بچنە نێو ئەو قەفەسەی بۆ ئەو سەردەم ئازادیبەخش بوو و تێیدا دەیانتوانی قسان بکەن، هەرچەندە ئەمڕۆ وادێتە پێشچاو کە ئەو گوتارە کۆنترۆڵکەر بووە و سەرنشینەکانیشی بە وێنەی تووتییەک لێکردووە کە لەقەفەسەکەشدا هەمان ئەو شتانە بڵێنەوە کە بۆی ئاراستە کراون!

کەواتە ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی عەرەبی ـ ئیسلامیانەیە و پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بەو تێکەڵبوون و

[3] المسعودي: *التنبيه والاشراف*، بيروت -١٩٨١ ص ٩٤.

[4] ئارشاک پۆلادیان: *کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا*. ل ١٦٠-١٦١.

نزیکبوونەوەیەی لە دوای دامەزراندنی سیستەمی خەلافەتی عەرەبی ئیسلامی دەستپێکردووە و برەوی سەندووە، بەتایبەتیش کاتێک زۆربەی کوردەکان لە هەردوو سەدەی دەیەم و یازدەهەمدا ئیسلام ببوون یان بە ئیسلام کرابوون[5]. لێرەشەوە پرۆسەی بە عەرەبکردن چەندە پرۆسەیەکە لە باوەشی ئایینەوە سەردەردەهێنێت و قورئان ڕێگە خۆشکەرێکە بۆ بەرزڕاگرتنی نەتەوە و زمانی عەرەبی و لێرەشەوە فەزڵی ئەوانی داوە بەسەر میللەتان و زمانەکانی تردا[6]؛ ئەوەندەش پرۆسەیەکی سیاسیانەیە کە لەلایەن

---

[5] هەر ئەو سەرچاوەیە، ل ١٧٢.

[6] لێرەدا هەندێ لەو ئایەتە قورئانیانە دەهێنمەوە کە پشتگیریی ئەم بۆچوونە دەکەن و ڕێگەمان پێدەدەن ئەو پرۆژەیە وەک پرۆژەیەکی عەرەبیی ئیسلامی لەقەڵەم بدەین. ئەمەش بەوەی کە مێژوونووس، فوقەهاکان و زانا عەرەبە مسوڵمانەکان، بە درێژایی مێژوو و بە پشتبەستن بە قورئان و پاشانیش لەژێر ڕۆشنایی ئەم کتێبە ئاسمانییەدا، چەندینجار فەزڵی عەرەبیان بەسەر میللەتانی دیکەدا داوە و ئەمەشیان بەکارهێناوە بۆ گەورەکردنی «من»ە عەرەبی و دەستەمۆکردن و ماڵیکردنی شوناسەکانی دی لەژێر سێبەری ئەم شوناسەدا. ئەمە جگەلەوەی ویستویانە لەم ڕێگەیەوە ناسنامەی ئیسلام پەیوەست بکەن بە ناسنامەی عەرەبییەوە. سەرەتا ئایەتەکان و پاشان دەقە کوردییەکەیان لە وەرگێڕاوە کوردییەکەی عبدالرحمن شەرەفکەندی (هەژار)ی موکریانییەوە، دەگوێزمەوە و ئەمجا ئایبەتمەندی ئایەتەکان دەنووسمەوە:

١- وكذلك انزلناه حكماً عربياً. (ئێمە ئەم فەرمانەی خۆمان بە عەرەبی بۆ تۆ. هەنارد). لە ئایەتی ٣٧، سورەی الرعد.

٢- و كذلك اوحينا اليك قرآناً عربياً. (هەروەهاینە قورئانێکی عەرەبیمان بۆ تۆ هەنارد). لە ئایەتی ٧، سورەی الشور.

هەلومەرجی بابەتیی ئەو دەمەی سیستەمی خەلافەتەوە بەسەر کوردا سەپێنراوە. دەکرێت ئەمە وەک هەوڵدانێکی عەرەبە مسوڵمانەکان بۆ دروستکردنی پردی پێکەوە ژیان لەگەڵ کوردەکاندا؛ بەتایبەتی کاتێک وڵاتی کوردان یەکەمین مەڵبەندی ناعەرەبی بووە لەبەردەم سوپای فەتحکەری

٣- حم• والكتاب المبين• إنا جعلناه قرآناً عربياً لعلكم تعقلون•(حا، میم. بەم کتێبە کە هەموو شت نیشان دەدا. برِیارماندا ئەم قورعانە عەرەبی بێ؛ بەشکو بتوانن تێبگەن.) ئایەتەکانی ١-٣، سورەی الزخرف.

٤- قرآناً عربياً غير ذي عوج لعلهم يتقون. (قورئانێکە بە عارەبی و خێچ و خواری تێدا نیە.) ئایەتی ٢٨، سورەی الزمر.

٥- ولقد نعلم أنهم يقولون إنما يعلمه بشر لسان الذي يلحدون إليه أعجمي و هذا لسان عربي مبين. (ئێمە ئەوە باش دەزانین ئەوان ئێژن: بنیادەمێ فێری دەکا. ئەوکەسەی ئەو نیازیانە لە عارەبی دا کۆڵیەو ئاشکراشە کە زمانی ئەم قورئانە بەعارەبی یەکی ڕەوانە.) ئایەتی ١٠٣، سورەی النحل.

٦- ولو جعلناه قرآناً اعجمياً لقالوا لولا فصلت آياته أأعجمي و عربي. (گەر ئێمە ئەم قورعانەمان بە عەجەمی بناردایە، دەیانگوت: چۆن نیشانی بەڕونی شی نەکراونەتەوە؟ خۆی عەرەبە و نیشانەکانی عەجەمین.) لە ئایەتی ٤٤، سورەی فصلت.

٧- كنتم خير أمةٍ أخرجت للناس. (ئێوە چاکترین کۆمەڵن لە ناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا.) لە ئایەتی ١١٠، سورەی ال عمران.

بۆ دۆزینەوەی ئایەتەکان سوودم لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتووە:

- رضوان السيد: *مفاهيم الجماعات في الاسلام*(دراسات في السوسيولوجيا التاريخية للاجتماع العربي الاسلامي). بيروت ١٩٩٢، ص ١٢٦-١٢٧.

- عبدالرحمن شرفكندی«هەژار» (وەرگێر): *قورئانی پیرۆز*. ناشرین: انتشارات تازە نگاە، نشر احسان، تهران، بەبێ ساڵی چاپکردن.

ئیسلامدا، تەماشا بکەین[٧]. هەروەها لە ڕوانگەی عەرەبەکانەوە بڕوایەکی پتەو هەبووە بەوەی کە دەبێت **«کۆششی بەکوڵ بکەن تا کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن»**[٨].

هۆکارەکانی ئەم دیاردەیەش لەوەدا بەرجەستە کراون کە: هەرچۆنێک بووە نابێت کورد لەناو سیستەمی خەلافەتدا ببێتە درێژکراوەی ڕەگەزی فارس و تورک، کە هەریەکەیان تا ئەوکاتە بە ڕێژە و قورساییەکی زۆرەوە دزەیان کردبووە ناو دامودەزگا کارگێڕییەکانی دەوڵەت و تا دەهات کاریگەرییان لە پلەوپایە سەرەکییەکاندا پتر دەبوو[٩]. ئەمەش بەتایبەتی کە سیستەمی ناوبراو لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئەمەوی ساڵی ٧٥٠ی زایینی، باری پشێوی بەخۆیەوە دەبینی و عەباسییەکان ئەگەری سەرهەڵدانی گەلێ بزووتنەوەی میللییان هەست پێدەکرد[١٠].

ئا لێرەشدا دوو خاڵمان دێتە دەست. یەکەمیان ئەوەیە کە پێماندەڵێت بەئیسلامبوونی کوردەکان نەبۆتە گەرەنتێک تا دەسەلاتدارانی خەلافەت بڕوایان پێبکەن و لێیان دڵنیابن، کە لەبارودۆخی گونجاودا لە دەسەلات هەڵناگەڕێنەوە، بەتایبەتیش ئەوان دەیانزانی کوردەکان زۆر ملیان بۆ

---

[7] حکیم احمد مام بکر: *الکرد و بلادهم عند البلدانیین و الرحالة المسلمین* (٢٣٢-٦٢٦هـ/٨٤٦-١٢٢٩م)، رسالة دکتوراه ٢٠٠٣م، ص ٢١٦.

[8] ئارشاک پۆلادیان: *کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا*. ل ١٧٤.

[9] ئارشاک پۆلادیان: *کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا*. ل ١٧٣.

10 هەرئەو سەرچاوەیە، ل ١٧٣-١٧٤.

دەستدرێژی گەلانی تر شۆڕ ناکەن و لە کاتی پێویستدا سڵ لەوە ناکەنەوە بە گژیاندا بچنەوە. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو لۆژیکەوەیە کە فوقەهاشەکان لە چوارچێوەی «دار الاسلام»دا کاریان پێدەکرد و بەپێی مەبدەئەکانی ئەو لۆژیکەش دەبوو ئینتیما ڕیشەیی، کولتووری و جوگرافیەکان وەلا بخرێن، چونکە ئایینی ئیسلام هیچ مەرجێکی بۆ ڕەگەز و عەقیدە دانەنابوو. واتە جیاوازیی ڕەگەزی میللەتان نەدەبووە ڕێگر لەبەردەم یەکبرواییاندا و ئەم دوانە یەکتریان ڕەتنەدەکردەوە[11]، کەچی ئەم مەبدەئە سەبارەت بە کورد پراکتیزە ناکرێت و وێڕای مسوڵمانبوونەکەی، ڕەچەڵەکێکی عەرەبیانەشی بۆ دروستدەکرێت.

دووەم خاڵ ئەوەیە کە پێماندەڵێت: وێناکردنە بەراییەکانی عەرەب بۆ کورد پەیوەندییان هەبووە بەو قەیرانی ناسنامەیەوە کە عەرەبەکان لەسەر ئاستی سیاسی دووچاری ببوون و خۆی لە ڕووخانی ئەمەوییەکان و پاشتریش لە ترازان و هەڵوەشانەوە بەردەوامەکانی دەسەڵاتی عەباسیدا دەبینییەوە[12]. کەواتە وێناکردن بۆ ئەویدی، هەروەک وێنای یەکەمی عەرەب بۆ کورد،

---

[11] د. عبدالله ابراهيم: *المركزية الاسلامية، صورة الاخر في المخيال الاسلامي خلال القرون الوسطى*. المركز الثقافي العربي، بيروت ٢٠٠١، ص ١٤.

[12] ئارشاک پۆلادیان: *کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا*. لاپەڕەکانی ٤٣و ٥٦-١٠٤.

ویناکردنێکە لە ئەنجامی جۆرێ لە قەیرانەوە هاتووە و ئەم ویناکردنەش بۆ ئەوەیە خاڵی لێکچوون دروستبکات نەک خاڵی جیاکەرەوە و دابڕکەر. ئامانجیشی ئەوە بووە لە ڕێگەی دەستپێشخەریکردنەوە بۆ یەکخستنی ڕەچەڵەک، بوار بۆ کورد نەهێڵێتەوە وەک ڕەگەزێکی جیاواز لە عەرەب بیر لە ناسنامەی خۆی بکاتەوە. بەتایبەتیش کە عەرەبەکانی بەڕایی گرنگییەکی تەواویان بە ڕەچەڵەکدۆزی دەدا و بەلایانەوە ڕەچەڵەک «ناسنامە»ی کەسەکانی دەستنیشان دەکرد[١٣].

لەکاتی قسەکردنماندا لەسەر پرۆسەی بە ئەویترکردنی کورد لەلایەن بەعسەوە، بۆمان دەردەکەوێت ئەم دوو خاڵە چەندە بە زیندوویی جارێکی دی سەرهەڵدەدەنەوە و لێرەشەوە بەعسییەکان تا چەندە لە هەمان بەدگومانیی عەرەبەکانی سەرەتا، سیاسەتێکی ڕگەزپەرستانە بەرامبەر بە کورد، دادەڕێژن و کوردناسییەکی بەعسیانەی شۆڤینی لە کەلەپووری عەرەب بەرهەمدەهێنن. بێگومان ئەمەش بەو جیاوازییەوە کە بەعەرەبکردنی بەڕایی پرۆژەیەکی تیوری و لە ئەنجامی ترس و بەدگومانییەکەوەیە بەرامبەر بە کورد، وەک نزیکترین میللەتێکی شەڕکەر لە دەسەڵاتی خەلافەتەوە. لەکاتێکدا «بەئەویترکردن» لەلای بەعسییەکان

[13] حکیم احمد مام بکر: *الکرد و بلادهم عند البلدانیین و الرحالة المسلمین* ص ٢١٤.

پرۆژەیەکی کۆنکریتی بوو کە دەبا لەسەر عەردی واقیع جێبەجی بکرێت و سڕینەوەی کوردیش ئامانجی هەرە سەرەکیی بوو. ئەگەر پرۆژەی یەکەم جۆرێک بووبێت لە قووتدان و شاردنەوەی کورد لەناو گەرووی‌ەکدا کە پێشتر بە پرۆسەیەکی دوورودرێژی فەتحکردندا تێپەڕیبوو، ئەمەش لە ئاستی سایکۆلۆژیدا «مـن»ێـکی هەڵاوساوی عەرەبیی دروستکردبوو، کە توانای قووتدان و شاردنەوەی کوردی هەبێت؛ ئەوە پرۆژەی بەعسییەکان هەڵهێنانەوە و تووڕدانەوەی کوردبوو لە پێناوی پاراستنی «مـن»ێکی عەرەبیانەی «خاوێن»دا کە ڕەگەز پەرستییەکەی بواری نەدەدایێ قەبووڵی هەبوونی کورد لەبەرامبەر خۆیدا بکات.
بەلام خاڵی سەرنجڕاکێش لەوەدایە کە لە هەردوو بارودۆخ و قۆناغدا، کورد لەناو هەمان یەکەی ئایینیدایە کە ئایینی ئیسلامە. واتە کوردیش لەسەر ئاستی باوەڕهێنان بەو بەها ڕۆحی و ئەخلاقی و عەقیدەییانەی لە قورئانەوە سەرچاوەیان گرتبوو، لەگەڵ عەرەبەکاندا یەکسان بوو. ئەو یەکسانیەی وایکرد کورد بێتە بەشێک لەو پانتاییەی ئیسلام بۆخۆی داگیری کردبوو و ئەمەش ببێتە هۆی ئەوەی بەشداریی کولتوریانەی کورد لە چوارچێوەی ئەم پانتاییە و بەپێی بەها ڕۆحی و ئەخلاقی و عەقیدەییەکانی ئەو پانتاییە بێت.

هەرچۆنێک بێت بەعەرەبکردنی کورد وەک پرۆسەیەکی تیۆریی و وەک فەفەسێکی ئاسنین، لە ڕوانگەی عەرەبە

مسولمانەکانەوە هەوڵدانێک بووە بۆ دەستەمۆکردن و خۆماڵیکردنی کورد (کورد بەهی خۆکردن). هەروەها بەخشینی جۆرێک لە دڵنیایی بووە بە هێزێکی گەورەی کۆمەڵایەتی کە ورووژاندن و تەرەکردنی لەبەرژەوەندیی ئەوکاتەی دەوڵەت و خەلافەتدا نەبووە. ئەمە جگە لەوەی دابەشکردنێکی ڕەمزیانەی «ڕەچەڵەکێک» بووە لەگەڵ کورددا؛ کە تا دەهات ئەو ڕەچەڵەکە پیرۆزیی خۆی لە ئایینی ئیسلامەوە وەردەگرت و لە بنەچەیەکی ئیسماعیلیی (المستعربە) و قەحتانی (العاربە)ەوە دەگۆڕا بۆ بنەچەیەکی عەرەبیی ئیسلامیانەی پیرۆز[14].

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە، کە دابەشکردنی ئەم پیرۆزییە لەسەر ئاستی ڕەچەڵەک، لەگەڵ کورد، پێچەوانەی گوتاری سەدەکانی ناوەڕاستی عەرەبە لە ئاست میللەتانی دیکەی دەرەوەی «دار الاسلام»دا، کە گوتارێکی ڕووتکەرەوە بوە و لەسەر داماڵین و شێواندن و پیسکردنی خەسڵەتی پیرۆزیی لە هەموو «ئەوەکانیتر»ی دەرەوە ئیشیکردووە[15].

---

[14] نارشاک پۆلادیان: *کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا*، ل ١٥٤-١٥٥.

[15] د. عبدالله ابراهيم: *المركزية الاسلامية*، ص ١١-١٣.

## دووەم: خۆ بەعەرەبکردن

ئەگەر بە مانایەک لە ماناکان بەعەرەبکردن بریتیبێت لە ئیمتیازێک، کە عەرەبەکان لە ساتێک لە ساتەکانی قەیرانی ناسنامەی سیاسیی خۆیاندا دەیدەنە کورد و وەک ئامرازێک بۆ دەستەمۆکردن و کپکردنەوەی ئەگەری نارەزاییەکانی ئەمەی دواییان بەکاری دەهێنن؛ ئەوە خۆ بەعەرەبکردن تەسلیمبوونی کوردە بەو گوتارە و بەکارهێنانیەتی بۆ خۆگونجاندن و دابینکردنی شوێنی خۆی لەناو گوتاری یەکەمدا. وەلێ دەبێت گوتاری یەکەم چەندە بەهێز و گشتگیر بووبێت تا کورد بخاتە ناو ئەو قەفەسە ئاسنینەوە و بیهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە چێژ لە بەعەرەبکردنی خۆی وەربگرێت؟ دەبێت پرۆسەی بەعەرەبکردن چ ئاسۆیەکی بۆ ئەوسای کورد دەستنیشان کردبێت، تا کوردیش خۆبەعەرەبکردن وەک تاکە دۆخی مانەوەی خۆی قەبووڵ بکات و بگرە شانازیشی پێوە بکات؟

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو گریمانەیەیە کە دەڵێت: ***بەعەرەبکردن پێشمەرجە بۆ خۆبەعەرەبکردن و یەکەمیان خەونێکە ئەویتر دەیبینێ و دووەمیشیان وەدیهێنەری ئەو خەونەیە.*** ئەگەر کورد نەکەوتبا باوەشی پرۆسەی خۆ بەعەرەبکردنەوە، ئەوە پرۆسەی بەعەرەبکردن هەرگیز

مانایەکی نەدەبوو. چونکە ئەگەر بەعەرەبکردن بریتیبێت لەو ناسنامەیەی عەرەب بە کوردی بەخشیوە تا خۆی نەبێت، ئەوە خۆ بەعەرەبکردن دەستهەڵگرتنی کورد بووە لە خودی خۆی و جۆرێک بووە لە خۆ خاڵیکردنەوە لەهەموو ئەو مانایانەی کوردبوونی ئەویان بەو مانایەی لەو سەردەمەدا باو بوو، پێکدەهێنا. یاخود دەتوانین بڵێین، ئەگەر خۆبەعەربکردن جۆرێک لە «هاوگونجاندنی» دروستکردبێت، ئەوە نەگونجاوترین جۆری ناسنامەی بەخشیوەتە کورد و ئەمیش قەبووڵیکردووە. چونکە ئاشکرایە بە خاڵیکردنەوەی کورد لە ناسنامەی خۆی هەموو ئەو زەمینەیەش بە بەتاڵی دەمێنێتەوە کە شوناس تیایدا دەخەملێت. شوناس لەو زەمینەیەدا گەشە دەکات کە ئازادیی پرسیارکردن لە ئارادا بێت و یەکێکیش لەو پرسیارانە پرسیاری خودە لە خۆی و لە جیهانی دەوروبەری خۆی. بەڵام کاتێک خود لە خۆی بەتاڵ دەکرێتەوە، ئەوە هەموو ئەو پرسیارانەش بێدەنگ دەکرێن کە پەیوەندیی خود بە خۆی و بەجیهانی دەوروبەریەوە دیاری دەکەن. بۆیە ئەگەر بەعەرەبکردن لە ڕوانگەی نەخشەدارێژەکانییەوە جۆرێک لە ئیمتیاز بووبێت، ئەوە ئەم ئیمتیازە دیاریی ستەمکارێکە بۆ بەرامبەر تا لە خودێکی سەربەخۆوە بیکاتە خودێکی ملکەچ، خودێک کە لە پێناوی مانەوەی خۆی و گەورەکردنی ستەمکاردا، خۆی بە کۆیلە

دەکات و هەموو خۆ بەکۆیلەکردنێکیش پێگە و مانەوەی ستەمکار بەهێز دەکات[16].

بەسەرهاتی ئەم پەیوەندیەی کورد لە ئاست شوناسی خۆبەعەرەبکردندا چیرۆکێکی دووروودرێژە و تا ئێستاش بەردەوامە. وەلێ بە پێچەوانەی چیرۆکە باوەکانەوە، پاڵەوانی ئەم چیرۆکە (کە میر و سەردار و پادشا و دەسەڵاتدارە کوردەکانن)؛ لەمیانەی بەسەرهات و ڕووداوەکاندا خۆی دروست ناکات و گەشە بە کەسێتی خۆی نادات، بەڵکو بەردەوام کەسبوونی خۆی لەدەست دەدات و ئەویتر بەرجەستەدەکات. هەمیشە خۆی بچووک دەکاتەوە و ئەویتر گەورە دەکات. هەردەم دەکشێتە دواوە و ئەویتر دەهێنێتە جێگەکەی خۆی. بەردەوام خۆی بێدەنگ دەکات و لێدەگەڕێ ئەویتر لەجیاتی ئەم قسان بکات و ...

یەکەمین دەرکەوتەکانی خۆبەعەرەبکردن خەسڵەتێکی مێژووییان هەیە و لەناو هەلومەرجێکی بابەتیانەوە فەرز دەکرێن، بەڵام هێندی هێندی لە میانەی ڕەوتی مێژوودا؛ بۆ کورد دەبنە خەسڵەتی دەروونی و لە ناخیدا جێگیر دەبن و خۆ بەکەمزانی و شەرم و ترس و سنگفراوانییەکی ساختە بەرهەمدەهێنن کە بەهۆیەوە بەردەوام «من»ی کوردی

---

[16] لەمبارەیەوە بگەڕێوە بۆ: ئاتین دولابوتی: *سیاست اطاعت*(رسالەای دربارە بردگی اختیاری. ت. علی معنوی. تهران نشر نی، ۱۳۷۸.

تاراوگە دەکرێت و مافی خودبوونی خۆی لە دەست دەدات. دەبێتە کائینێکی بێ خود بۆ ئەویتر و لەخزمەت ئەویتر و هەڵقە لە گوێی ئەویتر، کە بێگومان هەموو ئەمەش لە قۆناغی جیاوازدا و بە شێوەی خۆی و بە پاساوی تایبەت ئاراستە دەکرێت.

ئەوەی لێرەدا پێویستە بگوترێ ئەوەیە: هەرچەندە یەکەمین ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە بە ڕووداوی خۆبەعەرەبکردنی کورد دەستپێدەکات، بەڵام کاتێک ئەم پرۆسەیە دەبێتە خەسڵەتی دەروونی و لە ناخدا جێگیر دەبێت، ئیدی زەمینەسازی دەکات تا کورد لە ئاست هەر لایەنێکی تردا دەست لە خودبوونی خۆی هەڵبگرێت. واتە *خۆبەعەرەبکردن لەئاستی دەروونیدا ڕێگە خۆشکەر بووە تا کورد لە ئاست هەر ئەوێکیتردا دووچاری هەمان خۆ بەکەمزانی ببێت و ئەویتر زۆر لەوەی کە هەیە گەورەتر بکات.*

خاڵێکی دی کە نابێت بەلایدا تێپەڕ ببین ئەوەیە، کە پێماندەڵێت دیاردەی خۆبەعەرەبکردن دیاردەیەکی گشتگرەوەی ناو ئەو جوگرافیایە نەبووە کە کورد تیایدا ژیاوە، یاخود بەلای کەمەوە سەرچاوەکان بەو جۆرە باسی ناکەن. بەڵکو ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەم دیاردەیە تایبەت بووە بەو چین و توێژە خاوەن دەسەڵاتە کوردانەی کە لەکاتی ڕەچەڵەک بردنەوەسەر و پەسەندکردنی ئەوەی ئەوان بە ڕەچەڵەک عەرەبن، هەستیان بە بەرژەوەندی

خۆیان کردووە و یەکەمین گرووپێکن کە ویستبێتیان خۆیان لەناو قەفەسە ناسنینەکەدا ببیننەوە. سەرچاوەکان باس لەم دیاردەیە وەک دیاردەیەکی سەراپاگیری ناو کۆمەڵگای ئەوسای کورد ناکەن، بەڵکو باس لەو سەردار و پادشا و میر و خاوەن دەسەڵاتە کوردانەی کۆن دەکەن، کە نەیاندەویست بۆ مانەوەی خۆیان ئەم هەلەیان لەدەست دەربچێت. لێرەوە زۆر سەیر نیە کە لە ئێستاشدا گەڕانەوەی خۆبەعەرەبکردن بە شێواز و پاساوەکانی ئەم سەردەمە، هەر لەناو ئەم چین و توێژانەوە سەریهەڵداوەتەوە و لە شوێنێکی دیکەدا، بە کورتیش بێت، دەگەڕێمەوە سەر ئەم بابەتە.

یەکێک لەدیارترین ئەو بنەماڵە کوردانەی کە گومان لە ڕەچەڵەکی کوردبوونیان نەکراوە و زانیاری ئەو سەرچاوانەش کە گەلانی دراوسێی کورد نووسیویانن ئەمە دووپات دەکەنەوە، ئەیوبییەکانن[17]. ئەگەرچی هەر لە کۆنەوە زۆر لە نووسەران لە ڕەچەڵەکی کورد بوون، یان عەرەببوونی ئەم بنەماڵەیەیان کۆڵیوەتەوە، وەلێ دواجار هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەسڵی ئەو بنەماڵەیە

---

[17] لەمبارەیەوە ئارشاک پۆلادیان: ***کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا***، ل ١٦٠ئاماژە دەکات بە کتێبەکەی نووسەری ئەرمەنی کیراکوس کانتساگیتی: ***مێژووی ئەرمەن***، یەریڤان، ١٩٦١، ل ١٥٠. هەروەها بڕوانە واسیلی نکیتین: ***کورد و کوردستان***. وەرگێڕانی خالید حسامی(هێدی)، هەولێر ١٩٩٨، ل ٥١٧ و بەرەو دوا.

کوردن و له هۆزی «ڕەوادی»ین[18]. ئارشاک پۆلادیان له کتێبەکەیدا، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەخاتە ڕوو که لێکۆڵەرەوەکان؛ وێڕای زانین و تەباییشیان لەسەر کوردبوونی ئەیوبییەکان، کەچی له هەوڵدانیش نەکەوتوون بۆ بردنەوەی ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیه بۆسەر ئەو یان ئەم هۆزی عەرەب و دەڵێت: «لەوەش پتر هەندێ نووسەر زانیاری وایان نووسیوە، ئەوەی لێ هەڵدەکرێندرێت، کەوا چەندین میری ئەیوبی نکوڵییان له عەرەب بوونی خۆیان نەکردووە»[19]. ئەوەی ئەم نووسەرە ئاماژەی پێدەکات (ئیبن واصل ئەلمازنی)یە که له بەرهەمێکیدا نوسیویەتی: **«دمستەیەک له پاشایانی بنەماڵەی ئەیوبی نکوڵییان دەکرد ڕەچەڵەکیان کورد بێت و گوتویانە: "ئێمە عەرەبین، بەلام لەلای کوردان نیشتەجێ بووین و ژنمان لێهێناون"»[20].** پۆلادیان، وێڕای تیژبینی ڕەخنەگرانەی له کاتی خوێندنەوەی سەرچاوەکاندا، ددانیش بەوەدا دەنێت، که بیری بەڕەچەڵەک عەرەب بوونی کورد لای ئەو هۆزە

---

[18] ئارشاک پۆلادیان: *کورد له سەرچاوه عەرەبیەکاندا*. ل ١٦٠.

[19] هەمان سەرچاوه، ل ١٦١.

[20] ابن واصل: *مفرج الكروب في اخبار بني ايوب*. قاهرة ١٩٥٣، ج ١، ص ٣.

کوردانەی لیرە و لەوێ لەسەر زەمینی دەوڵەتی خەلافەتی عەرەبی ئیسلامی بڵاو ببوونەوە، نەختێک برەوی هەبووە[21].

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا توێژەری کورد بۆی هەیە بەو بەڵگەیەی ئەو زانیاریانە لەو سەرچاوانەوە گواستراونەتەوە کە عەرەبەکان بە مەبەستی تایبەتی خۆیان نوسیویانن، یان لەژێر کاریگەرییاندا دووبارە کراونەتەوە، یاخود لەبەر ئەوەی خاڵین لە داتای زانستانەی مێژوویی و زیاتر لە بەندوباو دەچن، گومان لە گشت ئەو سەرچاوانە بکات. وەلێ کاتێک دەگەینە سەر سەرچاوە کوردییەکان، کە هەمان ئەو شتانەیان بە زیادیشەوە دووبارە کردوونەتەوە، چیدی ناتوانین ئەو مەیلە بشارینەوە کە نووسەرە کوردەکان و بنەماڵە خاوەن دەسەلاتەکانی کوردیش لەمبارەیەوە بوویانە.

دوو کەس لە دیارترینی ئەو مێژوونووس و نووسەرە کوردانەش، میر شەرەفخانی بەدلیسی و مەلا مەحمودی بایەزیدین، کە یەکەمیان وێڕای ڕەزامەندی لەسەر ڕەچەڵەکی عەرەبیانە، مەیلی بەرەو بە ئێرانیکردن «بە *فارسکردن*»ی کورد زیاترە و دووەمیشیان جەخت دەکاتەوە سەر بەعەرەبکردنی «*بەدەویانە*»ی کورد. یەکەمیان لە سەدەی شازدەهەمی زایینیدا ژیاوە و دووەمیشیان لە سەدەی نۆزدە هەمدا. ئەم دوو مێژووەش بایەخێکی

---

[21] ئارشاک پۆلادیان: ***کورد لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا***. ل ١٦٢.

گرنگیان هەیە، چونکە ئاشکرای دەکات؛ بەدوورکەوتنەوەمان لە سەدەکانی ناوەڕاست (کە تیایدا گوتاری بەعەرەبکردن سەر هەڵدەدات)، نە کاریگەریی بیروڕای نووسەرە عەرەبەکان کاڵ بۆتەوە و نە هەستی شانازیکردنی کوردانیش بە ڕەچەڵەک بردنەوەی خۆیان بۆسەر عەرەب، دامرکاوەتەوە و نە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی سەرچاوەکان لە بزاڤی مێژوونووسیی ئێمەدا سەبارەت بەو بابەتە خەملیوە.

سەرەتا شەرەفخانی بەدلیسی لە کتێبە نایابەکەیدا (*شەرەفنامە* ١٥٩٦ی زایینی) و لە چەندین شوێندا ڕەچەڵەکی هۆز و بنەماڵە کوردەکان دەباتەوە سەر هۆز، یان کەسایەتییەکی ناوداری عەرەبیی و تەنانەت غەیرە عەرەبیش، بۆ نمونە سەرچەلەی فەرمانڕەوایانی بەدلیس دەباتەوە سەر تەهماسبی کوڕی یەزدگەردی بیستەم پادشای فارس[22]. ئەو پێیوایە میرانی هۆزی (هەکاری) و هۆزی (شامبو) لە بنەماڵەی خەلیفەکانی عەبباسین و میرانی جەزیرەش دەچنەوە سەر خالیدی کوڕی وەلید، ئەگەرچی

---

[22] لەو بارەیەوە بڕوانە: الامیر شرف خان البدلیسي: *شرفنامة*. ت. محمد جمیل الملا احمد الروزبیاني. مؤسسة موکریاني للطباعة و النشر، کردستان/ اربیل ٢٠٠١، ص ٦٠٣. هەروەها سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەو هۆزانەی ناویان هات بە ڕیز تەماشای لاپەڕەکانی ( ٢٦٩، ٣٢٧، ٣٤٣، ٤٢٩، ٤٤١، ٥١٣، ٥٦٠ و ٦٠٣) بکە.

بەپێی سەرچاوەکان خالیدی کوڕی وەلید نەگەیشتۆتە ئەو ناوچەیە و بەهۆی بڵاوبوونەوەی تاعوونیشەوە هیچ یەکێک لە نەوەکانی نەماون[٢٣].

مەلا مەحمودی بایەزیدیش (١٧٩٩-١٨٦٧) لە دوو سەرچاوەی گرنگدا باس لە عەرەب بوونی ڕەچەڵەکی کورد دەکات[٢٤]. ئەگەرچی ئەو لە زۆر بواردا بیرکردنەوەیەکی ئاییندەخوازانە و ڕۆشنگەرانەی هەبووە و یەکەمین نووسەرێکی کوردە توانیبێتی لەکەنار تۆمارکردنە مێژووییەکانییەوە، بیروڕای مرۆڤناسانە، کۆمەڵناسیانە و دەروونشیکاریانەی کۆمەڵایەتی ورد بخاتەڕوو، هەروەها لە پێناوی ڕزگاربوونی کوردەکان لە پەرتەوازەیی و پارچە پارچەیی، ڕاشکاوانە باس لە پێویستیی دامەزراندنی

---

[23] لەمبارەیەوە بڕوانە: مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی: (وەرگێڕان و ساخکردنەوە): ***وڵاتگیری ڕەشەخاکی عێراق*** «فتوح سواد العراق» ، چ ١، سلێمانی ١٩٩٧ن ل ١٣، بەتایبەتی پەراوێزی ژمارە (٨). هەروەها تەماشای پەراوێزی ژمارە (١) لە لاپەڕە ٢٦٩ی شەرەفنامەدا بکە.

[24] مەلا مەحمود بایەزیدی: ***باب و نەریتی کوردەکان***. وەرگێڕانی د. شکریە رسول، ١٩٨٢، بەغدا. هەروەها: ی.ئی. ڤاسیلیەڤا: ***کتێبێکی نەدۆزراوە دەربارەی مێژووی کوردستان***. گۆڤاری ڕەهەند، ژ. ١٩٩٩/٨ و. عەبدوڵا مەردۆخ. ل ٢٠٨- ٢٢٧. ئەمە پێشەکی کتێبە نەدۆزراوەکەی مەلامەحمودی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

دەوڵەتی کوردی دەکات[25]، کەچی لە مەسەلەی دەستنیشانکردنی ڕەچەڵەکی کورداندا تەواو لە ژێر کاریگەریی نەزعەی خۆبەعەرەبکردندایە.

بایەزیدی لە سەرەتای کتێبی *داب و نەریتی کوردەکان*،ساڵی (١٨٥٨-١٨٥٩) بانگەوازێک دەدات و دەڵێ: «**با ئاشکرا بێ لای بەڕێزان، قوتابیان و شارەزایان و بینەران کە ئەم میللەتە کوردە لە کۆنا لە تیرەی عەرەبی بەدەوی "دەشتەکی"یەوە هاتوون**»[26]. پاش ئەمەش بایەزیدی، دیسانەوە بەبێ خستنەڕووی هیچ ڕوونکردنەوەیەکی لەبابەت ئەوانەی سەبارەت بە داب و نەریتی کوردان دەیانخاتەڕوو، دەڵێت: «**هەتا ووشەی کوردستانیش نەبووە**»[27] و بەبڕوای ئەو خاکەی پێیدەگوترێ *کوردستان*؛ پێشان «جێگایەکی چۆڵ بووە لە نێوان ئێران و خوراساندا»[28].

لە سەرچاوەی دووەمدا، کە هەندێ دووبارەبوونەوەی کتێبی «*داب و نەریتی کوردەکان*»یشی پێوە دیارە، بایەزیدی بە دووبارەکردنەوەی بیروڕای سەرچاوە کۆنەکان و بیروڕاکانی شەرەفخان سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کورد، سێ

---

[25] ی.ئی. ڤاسیلیەڤا: ***کتێبێکی نەناسراوە دەربارەی مێژووی کوردستان***. ل ٢٢٤.

[26] مەلا مەحموود بایەزیدی: *داب و نەریتی کوردەکان*. ل ١٩.

[27] هەمان سەرچاوە، ل ٢٠.

[28] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

«نەقڵ» دەگێڕێتەوە[29]. لە یەکەمیاندا کورد دەباتەوە سەر ئەو کەسانەی لە مارەکانی سەرشانی زوحاک ڕزگاریان بووە (*ڕەچەڵەکی ئەفسانەیی*)، لە دووەمیاندا کورد دەباتەوە سەر *کابرایەکی زل و زەبەلاحی چاو دەرپۆقیو و هەلاوساوی توکنی بیچم ترسێنەر*، کە وەک نوێنەری کوردان چۆتە لای پەیامبەری ئیسلام (*ڕەچەڵەکی دێوو درنج*). لە نەقڵی سێهەمیشدا کە وەک بۆخۆی دەڵێت:«**وێدەچێ نزیک لەڕاستییەوە بێ**»[30]، کورد دەباتەوە سەر «**ڕەسەنێکی نائاسایی**» لە نەوەی *یافسی کوڕی نوح*، کە بێگومان دەستەواژەی «ڕەسەنی نائاسایی» ئەگەر مانایەکی هەبێت ئەوە هیچ نیە لە «*ڕەچەڵەکێکی نارەسەن*» زیاتر.

ئەگەر نەمانەوێت هەروا بە ئاسایی بەلای شەرەفخان و بایەزیدیدا تێپەڕ ببین، بەتایبەتی سەبارەت بەوەی کە نەک هەر بڕوایان بە عەرەببوونی کورد هەیە و لەوبارەیەوە هیچ پرسیار و نیشانەیەکی سەرسوڕمان دانانێن، بەڵکو ڕەچەڵەکی غەیرە عەرەبیشی بۆ دەدۆزنەوە و پاشان لەلای بایەزیدی ڕەچەڵەکێکی نا مرۆییشیان دەدرێتە پاڵ؛ هەروەها ئەگەر نەمانەوێت بیروڕای ئەوان بەوە پاساو

---

[29] ی.ئی. ڤاسیلیەڤا: *کتێبێکی نەنوزراوە دەربارەی مێژووی کوردستان*. ٢١٠-٢١١.

[30] ی.ئی. ڤاسیلیەڤا: *کتێبێکی نەنوزراوە دەربارەی مێژووی کوردستان* ل ٢١١

بدەیـنەوە کـە هێشـتا هەسـتی نەتـەوەیی لـەلایان گەشـەی نەکردبوو، ئەوە ئەو گریمانەیە زیاتر دەچەسپێت کە پێشتر خستمە ڕوو و بە پێویستی دەزانم لێرەدا بگەڕێمەوە سەری.

ئێـمە پێشـتر گوتمـان، بەعەرەبکـردن پێشـمەرجە بـۆ خۆبەعەرەبکردن. ئەگەر کورد نەکەوتبا باوەشی پرۆسەی خۆبەعەرەبکردنەوە، ئەوە پرۆسەی بەعەرەبکردن هەرگیز مانایەکی نەدەبوو. ئەوەی مانا بە پرۆسەی بەعەرەبکردن دەبەخشێـت، بەپێرەوەچـوونی ئـەو *پرۆسـەیەیە لەلایـەن کـوردەوە.* چـونکە ئەگـەر بەعەرەبکـردن بریتیبێـت لـەو ناسنامەیەی عـەرەب بـە کوردی بەخشیوە تـا خـۆی نەبێـت، ئەوە خۆ بەعەرەبکردن دەستهەڵگرتنی کورد بووە لە خودی خۆی و جۆرێک بووە لە خۆ خاڵیکردنەوە لەهەموو ئەو مانایانەی کوردبوونی ئەویان پێکدەهێنا. یاخود دەتوانین بڵێین، ئەگەر خۆبەعەربکـردن جۆرێـک لـە هاوگونجـاندنی دروستکردبێـت، ئـەوە نەگونجاوتـرین جـۆری ناسـنامەی بەخشـیوەتە کـورد و ئەمـیش قەبووڵـیکردووە. چـونکە ئاشـکرایە بـە خاڵـیکردنەوەی کـورد لـە ناسـنامەی خـۆی، هـەموو ئەو زەمینەیەش بە بەتاڵی دەمێنێتەوە کە شوناس تیایدا دەخەملێت. شوناس لەو زەمینەیەدا گەشە دەکات کە ئـازادیی پرسـیارکردن لـە ئـارادا بێـت و یەکێـکیش لـەو پرسیارانە پرسیاری خودە لە خۆی و لە جیهانی دەوروبەری خۆی. بەڵام کاتێک خود لە خۆی بەتاڵ دەکرێتەوە، ئەوە هەموو ئەو پرسیارانەش بێدەنگ دەکرێن کە پەیوەندیی

خـود بـه خـۆی و بەجـیهانی دەورووبەریـەوە دیـاری دەکـەن و پەیوەندیەکـەش دەکەنـە پەیوەندییەکی *سەپاو*، ئەگەر نەڵێین تۆتالیتاریانە.

خـود ئەوکاتـە دەتوانێت پەیوەندیی بە خۆی و بە جیهانی دەورووبـەری خۆیـەوە بکـات، کـە سەربەخۆیی خۆی لە دەست نەدابێت. چـونکە ئەگـەر خـود بـەتاڵ کرابێتـەوە لـە خـۆی و شوناسێکی دیکـەی خرابێتـە پـاڵ کە خۆی نیە، ئەوە قەبووڵی هـیچ پەیوەندیـیەک لەگـەڵ دەرەوەی خۆیـدا ناکـات و ئـەو پەیوەندیـە مانـای نابێت. تەنیا مەگەر ئەو شوناسە تازەیەی دەدرێتـە خـود لـە ڕێگای ستەمکارییەوە بێ، یـان لەڕێگەی نەفـیکردنەوەی خـودەوە. بەمانەیـەکی دی: تەنـیا ئەوکاتـە پەیوەندیـیەک دەبێتە پـەیوەندی؛ کـە خود وەک جەوهـەرێک لـەو پەیوەندیـەدا پارێـزراو بێت و ئـەو پەیوەندیـیەش ببێـتە پـــەیوەندی بـــەو خـــودە ســـەربەخۆ و پارێـــزراو و ڕێـــز لێگیراوەوە.

شوناسێکی نـوێ بـۆ خـود، ئەوکاتـە شوناسێکی نوێیە؛ کە ئیزافەیەک بکاتـە سـەر خـود وەکـئەوەی کە لە خودی خۆیدا هەیـە و مانـای خودبوونەکـەی فراوانـتر بکـات، بـەڵام ئەگـەر ئـــەو شوناســـە لەســـەر حســـابی ســـڕینەوەی خـــودە جەوهەرییەکەوە بێت، ئـەوە شوناسێکی تۆتالیتاریانەیە، کە هـەر خـود خـۆی، دەکاتە قوربانیی یەکەم. بۆ نموونە: وەختێ نازناوێـک دەدەینە پاڵ تاکێک، کە هـەڵگری خودێکە و ناوێکی تایبـەت بـەخۆی هەیـە، ئـەوە ئـەو نازناوە ئیزافەیەکە بۆسەر

شوناسی جەوهەری و پێویستە لەخزمەتی چەسپاندنی تاکبوونی ئەو خودە سەربەخۆیەدا بێت کە نازناوەکەی پێ ئیزافە دەکرێت. واتە خزمەت بە سەربەخۆیی ناوە شەخسییەکە بکات و مانای تاکبوونی هەڵگری ناوەکە، جێگیرتر و فراوانتر بکات. وەلێ ئەگەر نازناوەکە ناوی شەخسیی تاکەکەسەکەی سڕییەوە و ئازادییەکانی سنووردار کرد، ئەوە نابێتە ئیزافەیەک بۆسەر شوناسی ئەو کەسە، بەڵکو شوناسە جەوهەرییەکەی دەخاتە لاوەو بۆخۆی لە جێگەکەی نیشتەجێ دەبێت. بەم پێیەش نازناوەکە نابێتە نازناو لە خزمەتی شوناسی یەکەمدا، بەڵکو خۆی دەبێتە شوناس. (*لەبەشی کۆتاییدا دەگەڕێمەوە سەر ئەم باسە*).

بۆیە ئەگەر بەعەرەبکردنی بەرایی لە ڕوانگەی نەخشەداڕێژەکانییەوە جۆرێکیش لە ئیمتیاز بووبێت درابێتە کورد و ئەگەر کوردیش ئەمەی وەک دیاری و بانگهێشتنێکیش لێکدابێتەوە و بەهۆیەوە گونجانێکیشی لەگەڵ ئەو هەلومەرجانەدا دروستکردبێت کە بەرامبەر خستوێتیە بەردەمی؛ ئەوە دواجار ئەم دیارییە، دیاریی ستەمکارێکە بۆ بەرامبەر تا لە خودێکی سەربەخۆوە بیکاتە خودێکی ملکەچ. خودێک کە لە پێناوی مانەوەی خۆی و گەورەکردنی ستەمکاردا، خۆی بە کۆیلە دەکات و هەموو خۆ بەکۆیلەکردنێکیش پێگە و مانەوەی ستەمکار بەهێز دەکات.

شەرەفخان و بایەزیدی؛ ئەوەندە تەسلیم بە گوتاری بەعەرەبکردن بوون، کە خۆبەعەرەبکردنەکەیان بۆتە پێشمەرج بۆ قەبوڵکردنی هەرشتێکی دیکەش سەبارەت بە ڕەچەڵەکیان! بە مانایەکی دی: خۆبەعەرەبکردن (خۆ بەئەویترکردن) لەلای ئەوان ئەوەندە بۆتە خەسڵەتێکی دەروونی و لە ناخیاندا جێگیر بووە، ئیدی زەمینەی خۆشکردووە تا لەئاست هەر لایەنێکی تردا دەست لە ڕەچەڵەکی کوردیانەی خۆیان هەڵبگرن و ئەو مەسەلەیەیان هێندە بەلاوە گرنگ نەبێت. وەک ئارشاک پۆلادیان گوتویە، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە: مەلا مەحمود وەک ڕووناکبیرێک و مامۆستای بواری فێرکردن، لەسەر دووبارەکردنەوەی شتێک سوورە؛ کە لە سەدەکانی ناوەندا خراوەتە ڕوو، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بەرجەستە نیشان بدات[31].

بێسوود نابێت لە پەراوێزی شەرەفخان و بایەزیدیدا[32] باس لە مێژوونووسێکی دیکەی کورد وەک نمونە بکەین، کە

---

[31] ئارشاک پۆلادیان: کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا، ل ١٦٤.

[32] لە ڕاستیدا لە پێش شەرەفخانیشەوە دەقی (یاداشتەکانی مەئمون بەگ کوڕی بێگە بەگ)مان هەیە کە نمونەی خۆبەکەمزانی و شکستەنەفسی نووسەرەکەی دەردەخەن و پێویستی بە توێژینەوەیەکی تایبەت هەیە. مەئمەن بەگ ئەم یاداشتانەی وەک سکالایەک پێشکەشی سوڵتان موورادی سێهەم کردووە و تیایدا وادەی بەندایەتی خۆی بۆ سوڵتانی تورک ئاشکرا کردووە و بەمجۆرەش

ڕوونتر ئاشکرای دەکات مێژوونووسە کوردەکان، وێڕای هەموو دڵسۆزییەکیان، هێشتا لەمەسەلەی ڕەچەڵەکدا چاوپۆشی دەکەن و ناتوانن خۆیان لە دووبارەکردنەوەی زانیاریی سەرچاوە کۆنەکان بەدوور بگرن. لەمەش گرنگتر ئەوەیە ئاشکرای دەکات ئەوان ئەوەندە تەسلیم بە گوتاری بەعەرەبکردن بوون، کە خۆبەعەرەبکردنەکەیان بۆتە پێشمەرج بۆ قەبوڵکردنی هەرشتێکی دیکەش سەبارەت بە ڕەچەڵەکیان. ئەو مێژوونووسەش (عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان)ـە، کە دەبێت لە ساڵی (١٨٦٨)دا کتێبی (*ڕەوشی کوردان*)ی نوسیبێت[٣٣].

عەبدولقادری بابانیش لەسەر ڕێچکەی مێژوونووسە کوردەکانی پێشخۆی و دیسان وەک ئەوان بەبێ گفتوگۆکردن و بەڵگەهێنانەوە، دوای ئەوەی باسی گەیشتنی بانگەوازی ئیسلام بە کوردستان و هاتنی سوارەی عەرەب بۆ وڵاتی کوردان و شەڕی نێوان کورد و عەرەب و سەرکەوتنی

---

خۆی دەناسێنێت: *«ڕەگەزی بەندە بێگە بەگ ئەگەڕێتەوە بۆ مەریەک لە ئەبو عوبەیدەی جەڕاح لە دە مزدە پێدراوەکەیە و میری ئیمانداران عەباس»*. بڕوانە: ***پاداشتەکانی مەئموون بەگ کوڕی بێگە بەگ***. وەرگێڕانی: سەلاح نەقشبەندی، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ٣١.

[33] عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان: ***ڕەوشی کوردان***. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: کەریمی حیسامی، ١٩٩١، ستۆکهۆڵم.

عەرەبەکان دەکات[34] لە باسی داگیرکردنی ناوچەی «پاوە»دا، (کە دیارە بۆیە داگیرکراوە چونکە کوردەکان لەوێ بەرگرییانکردووە)، دەبێژێ: «پاش وێرانکردنی خانوان و کوشتاری خەڵک ئاورگەی پاوەشیان وێران کرد. هێندێ لە لەشکری عەرەب کە ئەو شوێنەیان بەدڵ بوو، هەر لەوێ نیشتەجێ بوون»[35]. ئەمجا لە درێژەی قسەکانیدا دەکەوێتە زەمینەخۆشکردن بۆ بەعەرەبکردنی کوردەکانی ئەوێ و دەڵێت: «مەعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ هێندێ لەو عەرەبانە کە لە پاوە مانەوە، ژنی کوژراوەکانیان داگیر کرد و منداڵی زۆریان لێ وەباش خستن و لە دەوروبەریش خزمایەتیان پەیدا کرد و کەم کەم ئیسلام لەو چیا و لێرەوارە بڵاو بووە و *تا ئێستاش خەڵکی پاوە بنەچەکەی خۆیان دەبەنەوە سەر مەعازی کوڕی جەبەل و عەرەبەکانی تر کە لەوێ نیشتەجێ بوون*»[36]. (لارکردنەوەکە لە منەوەیە). بەم قسەیەدا عەبدولقادری بابان دەکەوێتە ناکۆکییەکەوە و ئەوەی بیر دەچێتەوە کە بوونی کوردەکانی پاوە دەکەوێتە پێش هاتنی عەرەبە مسوڵمانەکانەوە و هەر ئەمەش وایکردووە ئەوان بەرگریی بکەن، بۆیە ناکرێت ئەمەی دوایيان ببنە بنەچەکەی

---

[34] هەمان سەرچاوە، ل ٢٤-٢٦

[35] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥-٢٦.

[36] عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان: *ڕەوشی کوردان*. ل ٢٦.

ئـەوەی یەکەمـیان، تەنـیا مەگـەر بەپێـی گوتـاری خۆبەعەرەبکردن نەبێت.

لەمەش سەیرتر ئەوەیە کە ناوبراو لە باسکردنی مێژووی بابانـیەکاندا[37] لەدایکـەوە ڕەچەڵەکێـکی «فەرەنگـیانەی مەسیحیانە»یان دەداتە پاڵ و لە باوکیشەوە، بە شیوەیەکی ڕەمـزی؛ نازناویـان دەباتـەوە لای سـەرداری سـووپای عوسمـانی[38] بـۆ ئـەم مەبەستەش چیرۆکی مـەلا ئەحمـەدی *دارەشمانـە* دەگێڕێتەوە کـە چـۆن عاشقی کیژێکی فەرەنگی بووەو بەرهەمی ئەو عەشقەش (بابا سولەیمان، یان: سلێمان بەبە)ی سەرئەڵقەی میرەکانی بابانە[39].

کەواتـە وەک دەبیـنین، دوای یەکـەمین شـەپۆلی بەعەرەبکردن و پاشان خۆبەعەرەبکردن، ڕێگا خۆشدەکرێ بۆ قەبووڵکردنی هـەر ڕەچەڵەکێک بـۆ کورد، ئەمەش بەبێ خسـتنە ڕووی بەڵگـە، یـان گەڕانـەوە بـۆ سەرچـاوەی باوەڕپێکراو.

نەبوونی بەڵگەی بەرجەستە خەسڵەتێکی دیاری بەرهەمی هەندێـک لـەو نوسـەر و مێـژوونووس و خـاوەن بـنەماڵە و ئایـنزا کوردیانەیشـە کـە لـە سـەدەی بیستەمدا باسـیان لـە ڕەچـەڵەکی کـورد و بـنەماڵە و نـاودارانی ئـەم مـیللەتە

---

[37] هەمان سەرچاوە، ل ٨٣ـ ٨٩

[38] هەر ئەو سەرچاوەیە، ل ٨٨-٨٩

[39] عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان: *ڕەوشی کوردان*.ل ٨٩.

کردووه. وەکئەوەی خۆبەعەرەبکردن بەدرێژایی سەدەکان ئەوەندە ڕەچەڵەکی داکوتا بێت، کە ئیدی پێویستیی بە بەڵگە و سەچاوە هێنانەوە نەبێت. بۆیە ئەگەر باسی ئەو مەیلە لەلای چینی دەسەڵاتداری ئایەنزای ئیزیدییەکان و ئاماژەکردنی «*مەسحەفا ڕەش*»؛ کتێبی پیرۆزی ئەوان، بۆ خزمایەتی نێوان ئیزیدییەکان و خەلیفەکانی ئەمەوی نەکەین[40]، کە هەڵبەتە لە سەردەمی ئێستادا ئیزیدیەکان ئەوە ڕەتدەکەنەوە، ئەوە گێرانەوەی ڕەچەڵەکی بنەماڵەی بەدرخانییەکان بۆ خالیدی کوڕی وەلید، شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە.

ئەم بەسەرهاتەش لە (*یاداشتەکانی مێجەر نۆئێل لە کوردستان*)دا باسی لێوە کراوە[41].جارێ بۆ ئەوەی لەو کەش و هەوایە تێبگەین کە نۆئێل تیایدا ژیاوە و دیسانەوە بۆمان ئاشکرا ببێت کە گوتاری بەعەرەبکردن چۆن بۆتە بەشێک لە ناخی خۆبەعەرەبکردووی کورد، ئەو بەشە لە یاداشتەکانی ناوبراو دەنووسمەوە کە تیایدا باس لە «هەڵوێستی کوردەکان» بەرامبەر عارەبان دەکات: «**کوردەکان بە چاوێکی تایبەتی تەماشای دراوسێ عەرەبەکانیان دەکەن، بەو چاوە**

---

[40] ئارشاک پۆلادیان: *کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا*، ل ١٦٥.

[41] مێجەر نۆئێل: *یاداشتەکانی مێجەر نۆئێل لە کوردستاندا*. وەرگێرانی: حسێن ئەحمەد جاف، حسێن ع. ئێرگسەجاپی بەغدا، ١٩٨٤.

تەماشایان دەکەن کە قورئان بە زمانی ئەوان نێردراوە و پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت، وەک برایەک و هاودین تەماشا دەکرێن. هەست و سۆزێکی قووڵ و ڕیشەداریان هەیە بەرامبەریان و بە دراوسێ و هاوبەشی بەرژەوەندی ژیانیان دەزانن»[42].

ئەم هەڵوێستەی کوردەکان، نیشانەی هاوسۆزی و هاوسێیەتی و سنگفراوانی ئەوانیش بێت، هێشتا ئەو خۆبەکەمزانییەی کورد ناشارێتەوە کە لە ئاست عەرەبدا هەیانە و لەسەر بنەمای پیرۆزکردنی زمانی ئەوان دامەزراوە، چونکە قورئانی پێ هاتۆتە خوارەوە. ئەم هەڵوێستەی نۆئێل بەناوی کوردەکانەوە تۆماریکردووە، هەمان ئەو هەڵوێستەیە کە پڕۆژەی بەعەرەبکردنی سەرەتا دەیویست کورد وەریبگرێت. ئەمە هەمان هەڵوێستی خۆ لەبیرکردن و خۆ کشانەوە دواوە و خۆکردن بە کۆیلە و ئەویتر بردنە پێشەوە و بەسەرداركردن و پیرۆزکردنیەتی، کە خۆبەعەرەبکردن لە ئێمەدا چاندوویەتی و بۆتە بونیادێکی سایکۆلۆژیش تا لە ئاست هەر کەسێکی تردا هەمان هەستی خۆ بەکەمزانی و ددان بەخۆدا گرتن و شەرم و لە مافی خۆمان خۆشبوون بەرجەستە بکەین. جارێک بەناوی ئەوەی ئەوانیتر لە نەژادی پاکن، جارێکیتر لەبەر

---

[42] هەمان سەرچاوە، ل ١٨٥.

ئەوەی زمـانی ئەوان زمانێکی پیرۆزە و جارێکی تریش بەو هۆیەوە کە ئەوانیتر ڕزگاریان کردووین.

مێـجەر نۆئـیل لـە بـردنەوەی ڕەچـەڵەکی بەدرخانـیەکان بۆسـەر خالـیدی کـوڕی وەلـید، بەڵگەیـەک ناخاتـە ڕوو، پێدەچێت بـە حوکمـی تێکەڵبوون، ئەم مەسـەلەیەی هـەر لـە زمـانی ئـەنداماني ئـەو بـنەماڵەیەوە بیستبێـت. لەڕاستیشـدا هـەر لـەم کتێـبەدا بـاس لـەوە کـراوە کـە جـەلادەت بـەدرخان لەوبارەیـەوە ڕوونکـردنەوەیەکی بڵاوکـردۆتەوە و سـوور بـووە لەسـەر ئـەوەی کـە خێـزانەکەیان هـیچ بەڵگـەو قەواڵەیەکیان نـەبووە و نـیە، بـەڵام ددانیشـی بەوەدا هێناوە کە لەوانەیە بچنەوە سەر خالید[43].

ڕێـک و ڕاسـت ئـەو ددان پێـدا هێنانەیشـە کـە هـەموو خەسـڵەتەکانی «مـن»ی بچـووککراوەی کـوردی لـە ئاسـت ئەویـتری گەورەکـراودا! ئاشـکرا دەکـات و وادەکـات وێـڕای نـەبوونی قەواڵـەو بەڵگـەش هـەر نەتوانێـت ئـەو ڕەچـەڵەکە ڕەتبکاتەوە کە ڕوونکردنەوەکەی لەسەر داوە!

مـن مەبەسـتم ئەوە نیە هیچ گومانێک بخەینە سەر گرنگیی بەرهەمەکـەی شەرەفخان و بایەزیدی و عەبدولقادری بابان و تێکۆشـانەکانی بـنەماڵەی بەدرخانیـیەکان، وەلـێ ئـەوە هەمیشـە پرسیارێکی ڕەوایـە: بۆچی ئەوان لە هەموو شتێکدا

---

43 سەرچـاوەی پێشـوو، ل ۲۱٥، بـڕوانە پەراوێـزی ژمـارە ۱۱۳ی وەرگێڕەکان.

داکۆکیبان لە کورد کردبێت کەچی لە مەسەلەی ڕەچەڵەکدا نەیانتوانیوە گوتاری بەعەرەبکردن ڕەتبکەنەوە و نەکەونە باوەشی خۆبەعەرەبکردنەوە؟ ئایا ئەمە دەلالەت لە ستەمکاری گوتاری یەکەم و تەسلیمبوونی کورد ناکات بەو گوتارە و قەبوڵکردنی ئەو ناسنامەیەی بۆیان دروستکراوە، وەک دۆخێک بۆ مانەوە و خۆ گونجاندن لەسەر حسابی دۆڕاندنی ڕەچەڵەک؟ کە بێگومان وەک پێشتر گوترا مەسەلەی ڕەچەڵەک لە لای عەرەبە مسوڵمانەکان یەکسان بوو بە ناسنامە...

یەکێکیتر لەو زانا و مێژوونووس و ڕاڤەکارە گەورانەی کورد، کە ئێستا لە ژیاندایە، بە هەمان ڕێچکەدا ڕۆیشتووە و بەبێ بەڵگەهێنانەوە، ڕەچەڵەکی چەند ناودارێکی کوردی بردۆتەوە سەر عەرەب، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسە.

هیچ پاساوێک بۆ دڵسۆزیی کوردانەی ئەم کلاسیکناسە وردبینە ناهێنرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کتێبی «*یادی مەردان*»[44] خاڵیی نیە لەو نمونانەی کە دەریدەخەن؛ گوتاری خۆ بەعەرەبکردن تا چەندە کاریگەریی خۆی بەجێهێشتووە. هەڵبەت هاندەری سەرەکیی بۆ نوسینی

---

[44] مەلا عبدالکریم مدرس: *یادی مەردان*. بەرگی ۱، ۱۹۷۹و بەرگی ۲، ۱۹۸۳چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد،بەغدا. هەروەها مامۆستا لە کتێبی «*بنەماڵەی زانیاران*»یشدا لەسەر هەمان ڕێچکە ڕۆیشتووە.

کتێبێکی شاوا گەورە، لەلای مامۆستا، ترس بووە لە لەبیرچوونەوەی ئەو باسە جوانانەی کە لەبارەی پیاوە ناودارەکانی وڵاتەکەیەوە بیستوونی[45]، ئەو پیاوانەی **«هەریەکێ لەوان وەکو گەردن بەندیکی گەوهەر وا بوون لە ملی گەردووونا، یا وەک شمشێرێکی دەبان بوون بەدەست پاڵەوانانی مەیدانەوە»**[46].

وێڕای ئەم هاندەرە ناسکەش، کەچی ناکرێت هەروا بەلای ئەم بەرهەمەدا ڕەت ببین، کە لە هەردوو بەرگەکەیدا بەلایکەمەوە ڕەچەڵەکی زیاتر لە حەوت ناوداری کوردی بردۆتەوە سەر تیرە و هۆز و کەسایەتییە عەرەبەکان، کە سیانیان ڕەمزییەتێکی تایبەتیان بۆکورد هەیە.

بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە، سەراپا بۆ مەولانا *خالیدی* نەقشبەندی تەرخانکراوە. مامۆستای مودەڕیس ڕەچەڵەکی بنەماڵەی مەولانا خالید لە باوکەوە دەباتەوە سەر تیرەی جافی مکایەڵی و لە دایکیشەوە دەیباتەوە سەر ساداتی پیر خدری. پاشان لە ناساندنی مکایەڵیدا نوسیویە: **«مکایەڵی تیرەیەکن لە جافی کۆچەری لە نەتەوەی پیر میکائیلن کە مەشهووورە بە پیر میکائیلی شەشە ئەنگووس»**[47]. ئەمجا لە درێژەی باسەکەیا لەبارەی پیر میکائیلەوە دەڵێت: **«ئەم زاتە**

---

[45] مەلا عبدالکریم مدرس: *یادی مەردان*. بەرگی ۱، ل ۳.

[46] هەمان سەرچاوە، بەرگی ۱، ل ۳.

[47] مەلا عبدالکریم مدرس: *یادی مەردان*. بەرگی ۱، ل ۷.

**لە نەوەی خەلیفەی سێهەم حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففانە»**[48].

لەبەرگی دووەمی هەمان بەرهەمیشدا؛ مامۆستا مودەڕیس ڕەچەڵەکی هەریەک لە *شێخ عوسمان سیراجوددین و مەولەوی تاوەگوزیی* شاعیر و هەندێکی تریش دەباتەوە سەر عەرەب. هەرچی ڕەچەڵەکی یەکەمیانە لە ڕێگەی (سەیید ظاهر) ناوێکەوە دەباتەوە سەر سەییدەکانی (نعێم) لەوێشەوە بۆ سەر نەوەی **«حەزرەتی حوسەینی کوڕی حەزرەتی عەلی»**[49]، پاشان بە درێژایی لاپەڕە (٨ و ٩)ی هەمان بەرهەم (ئەمجارەیان بە گەڕانەوەی بۆ دەسنووس و سەرچاوە)، باس لەبنەچەی ئەم کەسایەتیە دەکات تاکو بەم ئەنجامە دەگات: **«بەپێی ئەم سەرچاوانە دەرکەوت کە شێخ عوسمان سیراجوددین لە لایەنی باوکیەوە لە سەییدەکانی نعێم و لە نەوەی حەزرەتی حوسەین و، لە لاینی دایکیەوە لە سەییدەکانی شازلی و لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە»**[50].

بەڵام لەلای مامۆستا مودەڕیس بنەچەی مەولەوی **«ئەچێتەوە سەر خواناسی ناودار سەیید موحەممەد زاهیدی کوڕی مەحمودی مەدەنی کە بە پیر خدری شاهۆ ناسراوە و،**

---

[48] هەرئەوی، ب ١، ل ٧.

[49] مەلا عبدالکریم مدرس: *یادی مەردان*. بەرگی ٢، ل ٧.

[50] هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢، ل ٩.

**لـە نـەوەی حەزرەتی حوسەینی کوڕی حەزرەتی عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب و فاتیمەی زەهرایە»**[51].

وەک دەبیـنین تـەوژمی خـۆ بـردنەوە سـەر عـەرەب و بەکارهێنانی ئەمە بۆ وەرگرتنی ڕەوایەتی و پیرۆزیی لەناو کۆمـەڵگای کوردیـدا و لـە کایەی دینیدا، تا ساتەوەختی «یادی مـەردان»یش بەردەوامیی خۆی هەیە. ئەمـەش ئـەوەمان بۆ ئاشـکرا دەکـات، کـە واپێدەچێـت پیشـە و بەرهـەم و ژیـانی چـەند پشتێکی ئـەو کەسایەتیانە لـەناو کۆمـەڵگای کوردیـدا بـــەس نەبووبێـــت بـــۆ پـــتەوکردنی پێـــگە ئایـــینی و کۆمەڵایەتیەکانـیان. بۆیـە هەسـت بـەوە کـراوە کـە دەبێـت بەهـەر هۆیـەک بـووە لەگـەڵ سەرچـاوەیەکی «بـاڵا»تـردا و بـەهۆی زمانێـکی تایـبەتی ئایینیـیەوە کـە خاڵـیی نـیە لـە *پـــیامەڵدان و بەرزنـــرخاندن و ســـۆزگەرایی*، پەیوەســـت بکرێن[52].

---

[51] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی ۲، ل ۳٦۲.

[52] مـن لـەم باسـەدا نەمویسـتووە مەسـەلەی نەسـەبنامەی شێـخەکان بخەمـە بـەرباس، چونکە ئەوباسـە لیسـتەکەی درێژتر دەکـردەوە و نـاوی کەسـانی وەک شێـخ مـارفی نۆدێی و شێـخ مەحمودی حەفید و هـەندێ سـەرکردەی تـری کـوردی تێدەکەوت. بەڵام سەبارەت بەوەی نەسـەبنامە و سـەرچەلە لـەلای ئەهـلی تەریقەتـەکان چەندە گرنگە و بۆچی گرنگە، بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:

## خۆبەعەرەبکردنی هاوچەرخ

ساتەوەختی ئێستای ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و زەوقیی کورد بەدەست ناکۆکی و دژایەتییەکی ئاڵۆزەوە دەناڵێنێت. لەلایەکەوە هەرگیز ئەوەندەی ئێستا باس لە تەعریب و ئەنفال و گۆڕی بەکۆمەڵی نەکراوە و لەپشت باسکردنی هەموو ئەمانەیشەوە هەردەم هوشیارییەکی ڕەخنەگرانە بەرامبەر بەو کولتووورە عەرەبیی ئیسلامیەی بەعسییەکان دەربڕی بوون و تەوزیفیان دەکرد، لە ئارادایە. لەلایەکی دیکەیشەوە ئێستا ناوی عەرەبیی ئیسلامیی لە منداڵی کورد زیاتر دەنرێت و مۆسیقا و کەلەپووری عەرەبی لە کۆمەڵگای کوردیدا ڕەواجی زیاتری پەیدا کردووە. ئەگەر ئەمە لە ئاستی جەماوەریدا بگێڕینەوە بۆ لاوازیی هووشیاریی نەتەوەیی و تەوژمی بەجیهانیبوون و زەوقی تاکەکەسی، ئەوە لە بواری گوتاری سیاسیدا حاڵەکە زۆر وێرانترە.

بێگومان خۆبەعەرەبکردنی ئێستا لەوەدا نییە کە سیاسەتمەدار و سەرۆک حیزبەکانی ئێمە ڕەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر عەرەب، بەڵکو لەو شەرمە زۆرەیاندایە لەوەی وەک کورد خۆیان بناسێنن و کوردبوونی خۆیان

---

- مارتین وان بروین سن(ڕاستییەکەی: مارتین ڤاون برۆنسن): *جامعەشناسی مردم کرد*(اغا، شیخ و دولت) ساختارهای اجتماعی و سیاسی کردستان. ت: ابراهیم یونسی، تهران، نشر پانیذ. ۱۳۷۹.

بشارنەوە. ئەوان نەک هەر لە ماوەی سێ مانگی ڕابردوودا و لە چوونیاندا بۆ بەغدا، یەکجار بە جل و بەرگی کوردییەوە نەبینران، بەڵکو لە کۆبوونەوەکانیشدا یەک جار بە زمانی کوردی قسەیان نەکرد. ئەمە جگە لەوەی لە پڕێکدا ئەوەندە بوونەوە بە «عێراقی» کە مرۆڤی ئاسایی وا هەستبکات کوردبوون عەیبەیە. ئەگەرچی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی پارتی و یەکێتی لەماوەی دوازدە ساڵی ڕابردوودا خۆیان لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی هونەری و کەلەپووری عێراقی بەدوور دەگرت، کەچی لە ئیستادا و لە باشترین کاتەکانی ناردندا، *کوردستان تیڤی* و کەناڵی *کوردسات* کێبڕکێیانە لەسەر ناردنی بەرنامەکانیان بە عەرەبی. هەر ئەم دوو حیزبەش ڕۆژگارێک تەنگاو بوون لەوەی کامیان ڤیستیڤاڵی گەورە و میوانداریی نایاب بۆ برا عەرەبەکان ساز بکەن و دروستکردنی پڕ مەسرەفترین پەیکەریش بۆ شاعیرێکی عەرەب لە هەردوو شاری سلێمانی و هەولێر لە ئەستۆ بگرن، ئەمەش لەکاتێکدا بۆ پەیکەری کوردترین شاعیری وەک حاجی قادری کۆیی خەڵک بۆخۆی پارەی کۆکردۆتەوە. هەروەها گۆڤار و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە، بەشێک لە ڕۆشنبیران و نووسەران لەدوای داتەپینی ڕژێمەوە، کێبڕکێیانە بۆ بڵاوکردنەوەی هەرچی زووتری ***ژمارەیەکی تایبەت*** لە گۆڤارەکانیان بە زمانی عەرەبی، یان هەر دەرکردنی گۆڤارێکی نوێ بەو زمانە.

ئالای کوردستان و ئالای عێراق بۆ یەکەمجار لەسەر دەستی کورد کرانە دوو ڕووی یەک دراو.

لەلایەکی ترەوە ژمارەی ئەو چاوپێکەوتن و گفتوگۆیانەی هەریەک لە *بارزانی و تاڵەبانی* لەگەڵ ڕۆژنامەنووسە کوردەکاندا سازیانداون زۆر دەگمەنن، لەکاتێکدا هەردەم دەرگایان بۆ ڕۆژنامەنووسی پلە دوو و سێی ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبییەکان لەسەر پشت بووە.

بەمجۆرە دەبینین خۆبەعەرەبکردنی ئێستا، قۆناغی ڕەچەڵەک بردنەوە سەر عەرەبی جێهێشتووە و وەک بونیادێکی دەروونی کاری خۆی دەکات. ڕاستە بەشێکی ئەو نمونانە نمونەی لاوازن، وەلێ لەهەمان کاتدا وەلاتی مێژوویی ناخی خۆبەعەرەبکردووی ئێمە ئاشکرا دەکەن. ئەم ناخە خۆبەکەم تەماشاکردووە، ئەم ناخە دۆڕاوە بێ کاراکتەرە، کەسایەتی کوردی دووچاری بڕوابەخۆ نەبوون، شەرم، خاترانەگرتن، قسەنەکردن، دەستهەڵگرتن و کشانەوە لە مافەکانی خۆی، خۆبەکەمزانی و خۆ بچووککردنەوە، کردووە. هەموو ئەمانەش بونیادێکی دەروونیی ئەوتۆیان بۆ مرۆڤی کورد پێکهێناوە، کە نەتوانێت ناوەندگەرایانە و هاوسەنگانە بیر بکاتەوە و ڕەفتار بکات. ئەم کائینە، یا ئەوپەڕی لێبووردە و گوێڕایەڵ و ملکەچ و سنگفراوانە کە دنیا سەرسام دەکات، یاخود ئەوەندە تووڕە و شەڕانی و کەللەڕەقە کە نە لەگەڵ خۆی و نەلەگەڵ ئەوانیتردا هەڵناکات و لە هەردوو ئەم بارودۆخەشدا؛ ئەو کەسایەتی و

شوناسی خۆی لەدەست دەدات. کورد بەتایبەتی لەئاستی سیاسیدا هێڵی زێڕینی ناوەند ناناسێ، کە تیایدا پرسیارکردن دەبێتە پرسیار لە شوناسی خۆی. لەبەر ئەوەی ئەو لە هەردوو باری یەکەمدا خۆی نییە و دەبێتە خودێک بۆ ئەوانیتر، ئەوە هەرگیز ناتوانێت پەیوەندییەکی هاوسەنگ لەگەڵ خودی خۆیدا دابڕێژێت و بواری گەڕانەوە سەر خود بسازێنێ.

ئەم بونیادە سایکۆلۆژییە، کە ئەنجامێکی خراپی خۆبەعەرەبکردنە، بۆتە زەمینە خۆشکەریش بۆ ئەوەی کورد قەبووڵی هەر ناسنامە و کاراکتەرێکی دی بکات کە بەرامبەر پێی دەبەخشێت، یان بەسەریدا دەسەپێنێ و مێژووی دەوڵەتی عێراقیش بۆ کورد، جگە لە مێژوویەکی داسەپاو، کە تیایدا کورد کراوەتە بوونەوەرێکی پلە دوو، هیچی دیکە نەبووە. لە ئاستی سیاسیدا ئەوە هەمیشە سەرکردە کوردەکان بوون بە بیانووی «دانوستان» و «مفاوەزات» و «گفتوگۆ»کردنەوە، گەڕاونەتەوە باوەشی ڕژێم و سەدامیان بە حەکەم ناو بردووە. مێژووی مفاوەزاتەکانی ئێمە مێژووی وازهێنان و چاوپۆشیکردن بووە لە خودی کوردی و قەبووڵکردنەوەی ئەو وێنە دەستەمۆکراوەی بەرامبەر بۆی بەرهەمهێناوین. ئێمە لەو دانیشتنانەدا هیچ مافێکمان بەدەست نەهێناوە لە مافی بوونەوە بە بوونەوەرێکی ملکەچی لەڕووی دەروونییەوە کۆنترۆڵکراو زیاتر. هیچ خوێندنەوەیەکی دەروونشیکاریانە

بۆ کورد، لە خوێندنەوەی بەعسییەکان تێپەڕی نەکردووە. ئەوان لە هەرکەسێ باشتر ناخی کوردیان شیکردۆتەوە: مەرجەبای یەک ئەفسەری بەعسی و دانیشتن لەگەڵ کاربەدەستێکی پلە نزمی ڕژێم و زەردەخەنەیەک و دەست بەسەر شاندا هێنانێک، بەس بووە چاو لە خوێنی سەدان قوربانیی بپۆشین و پاساو بۆ توندڕەوی بەعس بهێنینەوە و خۆمان بە «پاسەوانی ئاسایشی نەتەوەیی عێراق» بزانین. سووپای عێراق و ڕۆژی ئەو سووپایە بۆ ئێمە هەمان پێگەی پیرۆزی هەبووە، کە بەعسییەکان بۆیان بەرهەمهێنا. ماچی سەرکردە کوردەکان بۆ بەعسییەکان؛ ماچی عاشقێکی خۆبەکۆیلەکردوو بوون بۆ مەعشوقێکی جەللاد. هەر ئەو مێژووەیشە کە بۆتە بونیادێک و پێشمەرجێک بۆ عاشقبوونمان بە هەر کەسێکی دی. ئەوەتا ئێستاش سەرکردە سیاسییەکانی ئێمە لەگەڵ ئەمەریکییەکاندا (لەهەر پلە و پایەیەکدا بن)، تا ئێستا نەبینراون بەرامبەری یەکتر دابنیشن، کە ئەوە سرووشتی دانیشتنە ڕەسمییەکانە. بەڵکو ئەمان یان بە پێوەن و سەر دەلەقێنن، یا لە دواوەن و بێدەنگن و چەپڵە لێدەدەن، یان لە تەنیشتەوەن و شەرمنانە وەسفی ئەویتر دەکەن. ئەوانە هەرگیز لە بەرامبەردا نین.

لە ئاستی ڕۆشنبیریی و ئەدەبیدا، ئێمە بەرهەمهێنەرەوەی نۆستالیژیای عێراقی بەعس بووین، نەک عێراقی بەدر شاکر سەییاب. شیعری ئێمە پڕە لە حوزن و نۆستالیژیا بۆ بەغدا وەک پایتەخت، نەک وەک شارێک بۆ

ژیان. ئاوی *دیجلە* و *فورات* ڕەمزێکی باوی ناو قەسیدەی کوردین و لەوێوە جوانن کە بەو پایتەختەدا ڕەتدەبن. بۆ بەشێکی نووسەران و ڕۆژنامەنووسانی کورد، کردنەوەی ڕێگای بەغدا و مووسڵ، لەوێدا مژدەیەکی خۆش بووە، کە جارێکی دیکە بچنەوە لە هەمان مەیخانەکانی پایتەختدا بیرەی «لوئلوئە» لەگەڵ ماسیی «مسگوف»دا فڕ کەن و لە هەمان چایخانەکانی جاراندا قەیماخی موسڵ بخۆن!

هەموو ئەم نۆستالیژیایە بونیادێکی سایکۆلۆژیی دەستەمۆبوومان بۆ ئاشکرا دەکات، کە ئەنجامێکی خۆبەعەرەبکردنە. ئەم بونیادە سایکۆلۆژیە خەسڵەتی خۆبەکۆیلەکردنی لەلای کورد بەهێز کردووە و ئەمەش جارێک بە پاساوی سیاسی و جارێک بە پاساوی ئایینی و جارێکی دی بە پاساوی کۆمەڵایەتی و دۆستایەتی دێرین و جاری دوایش بە پاساوی ڕۆژە خۆشەکانی جاران و هتد دەردەبڕدرێت.

## سێیەم: پرۆژەی ڕژێمی بەعس

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان پرۆژەی بەعەرەبکردنی بەرایی، کە بە خۆبەعەرەبکردنی کورد کۆتایی پێهات و ئەمەشیان زەمینەی خۆشکرد تا پادشا و میر و دەسەڵاتدار و مێژوونووسە کوردەکان، لە قۆناغی جیاجیادا و بە پاساوی جۆربەجۆر و لە ژێر گوشاری تایبەتدا ئامادە ببن بۆ قەبووڵکردنی هەر ناسنامەیەکی دیکەی غەیرە عەرەبیش، لەگەڵ پرۆژەی تەعەریبکردنی کوردەکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە. ئەم جیاوازیەش هەم لە ڕووی چۆنایەتی و هەم لە ڕووی چەندایەتییەوەیە و ئەنجامگەلێکی تریشی بۆ کورد لێکەوتەوە.

ئەگەر پرۆژەی یەکەم زیاتر لە ڕووی مەعنەوییەوە کوردی خستە نێو قۆناغێکی نوێی مێژوو، کولتوور و ڕەچەڵەکەوەو لە ڕووی ژیاری و ڕۆشنبیرییەوە بە ئاقارێکی جیا لەوەی پێشووتردا بردی و ئەمەش ڕۆڵی بەرچاوی گێڕا لە داڕشتنی شوناسێکی دیکەدا بۆ کورد، ئەوە پرۆژەی دووەم لە بنەماوە کەینونە و بوونی شوناسی کوردیی خستە بەردەم هەڕەشەیەکی پڕ مەترسی و دەیویست خەسڵەتی مرۆڤبوونی لێبستێنێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیەکی گەورە دەکەین، گەر پرۆژەی بەعس بە

جیاواز و دابڕاو لە پڕۆژەی بەعەرەبکردنی بەرایی لێکبدەینەوە و پێمانوابێت: ئەوەی یەکەمیان لە ئاستی کولتووری و مێژووییدا، دابڕاوە لە تاوانەکانی ئەوەی دووەمیان لە ئاستی مادیی و ڕۆحیدا. بێگومان ئەوەش قسەیەکی بێمانایە گەر بڕوامان وابێت، عەرەبەکانی سەرەتا پرۆسەیەکیان دەستپێکرد بەو ئاواتەی بەعس بۆیان بهێنێتە دی، چونکە ئەم لێکدانەوەیە لە شۆڤێنیزمێکی کوردیانەدا خۆی بەرجەستە دەکات؛ کە توانای لێکدانەوەی مێژووی نیەو ناشتوانێت بەعس لە کۆی کولتوری عەرەبی و ئیسلامی دابڕ بکات.

لێکدانەوەیەکی واقیعیانەو عەقلانیانەی هێمن پێماندەڵێت: ئەوەی بەعسییەکان لە دژی کورد و بەناوی عەرەب و ئیسلام و ئەو کولتوورەوە کردیان، ئەگەر زیانی بۆ مێژووی عەرەب و کولتوورەکەیان هێندەی ئەو زیانەی لە کوردیاندا نەبێت، هیچی وەهای کەمتر نەبووە. بەعسییەکان لە تەوزیفکردنی کولتوور و کەلەپووری نووسراوی عەرەب دا ئەوەندە زیادەڕۆییانکرد و بەهەڵە لەبەرژەوەندی ڕەگەزپەرستانەی خۆیاندا دەکاریان هێنا، کە بوونە هەڕەشەیەکی گەورە بەسەر هەمان کولتوورەوە و وێنەیەکی دزێویشیان پێبەخشی. هەر ئەو تێکەڵکردنەیشە، کە هەڵوێستی ناسیۆنالیستە پەڕگیرەکانی کوردیش لێوەی سەرچاوە دەگرێت و وایان لێدەکات پەرچەکردارانە خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر تەواوی ئەو کولتوورەدا

بهینن و نەتوانن خوێندنەوەیەکی جیدییان بۆی هەبێت. لە کاتێکدا ئەو کولتوورە، جگە لەو ڕەهەندە سەربازییەی کە لەکاتی بەئیسلامکردنی کوردەکاندا بەرجەستە بوو، چەندان ڕووی گەشی هەیە و هەروەها بەشێکی بەرچاو لە کولتووری کورد خۆی و سەرمایە ڕۆحییەکەیشی پێکدەهێنێت.

کێشەکە لەوەدایە ئێمەی کورد زاراوەی «تەعریب» بۆ پیشاندانی دڕندەیی بەعس بەکار دەهێنین، لە کاتێکدا «تەعریب بەمانای بە عەرەبکردن» وەک لە بەشەکانی دیکەی ئەم باسەدا بۆمان دەرکەوت، ئیمتیازێکە و مانایەکی پۆزەتیڤیانەی هەبووە. پرسیار ئەوەیە: *ئایا رژێمی بەعس لە عێراقدا ویستوویەتی ئەم مانایە بدات بە تەعریب یاخود لە بنەمادا ویستوویەتی پرۆسەیەکی تر ئەنجامبدات کە تیایدا مانا سەرەتاییەکەی بەعەرەبکردن دەشێوێنرێت و بگرە فڕێ دەدرێتە دەرەوە؟*

وەکئەوەی لە بەشی یەکەمدا بۆمان ئاشکرابوو، مانای پۆزەتیڤانەی «تەعریب/بەعەرەبکردن»ی بەرایی، واتە جۆرێ لە یەکسانسازی و سڕینەوەی جیاوازیی لە نێوان «ئێمە» و «ئێوە»دا؛ بەڵام ئەوەی بەعس کردویەتی هەوڵدان بووە بۆ سڕینەوەی «بەرامبەر» و بچووککردنەوەی لە ئاست «خۆمان»دا، ئەمەش لە پێناوی ئەو تێگەیشتنەدا کە بەعسییەکان بۆ گەورەکردنی «عروبە»ی خۆیان هەیانبوو.

ئێستا بۆئەوەی خۆمان لە مانای پۆزەتیڤانەی تەعریب رزگار بکەین و نەکەوینە ناکۆکی لەگەڵ ئەو پرۆسەیەی

بەعس لە کوردستاندا ئەنجامیداوە و دژی بەعەرەبکردنە، پێشنیاری زاراوەیەکی تر دەکەم، کە ئەویش زاراوەی «بەئەویترکردن»ە. بەکورتی دەمەوێت بڵێم: بەعس نەیویستووە کورد بکاتە عەرەب، بەڵکو ویستوویەتی بیکاتە ئەویتری عەرەب هەتا بتوانێ وەک هەڕەشەیەک تەماشای بکات و وەک دوژمنێک وێنای بکات و دواجار بەرنامەی لەناوبردنی دابڕێژێ.

## بەئەویتر کردن:

لە سادەترین مانایدا «بەئەویترکردن» واتە جیاکردنەوەی دەرەوە لە خۆمان و لەهەمان کاتدا گەورەکردنی خۆمان لەسەر حیسابی بچووکردنەوەی ئەوانیتر. بە ئەویترکردن واتە بوار نەدان بە ئەوانیتر تا وەک ئێمە بن و لەئاست و پێگەی ئێمەدا نەبن. ئەمەش پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە مەسەلەی دروستکردنی «ناسنامە»ـەوە. هەموو تاکێک، یان گرووپێک یاخود کۆمەڵگایەک، ناسنامەی خۆیان لە ڕێگەی بەپەراوێزکردنی ئەوانیترەوە بەدەست دەهێنن: من کێم؟ پەیوەستە بەوەی ئەوانیتر کێن؟ چونکە هەمیشە **«ئەویتر خۆمانمان بۆ ئاشکرا دەکات»**[٥٣].

[53] طاهر لبيب: (محرر): *صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا اليه*. مركز دراسات الوحدة العربية، ١٩٩٩،بيروت. ل ٩٣.

بۆیە پرۆسەی بەئەویترکردن چ وەک پرۆسەیەکی ژیاری و کۆمەڵایەتی تەماشا بکەین، یان وەک پرۆسەیەکی سیاسی، ئەوە دەمانخاتە بەردەم دوالیزمێکی نایەکسان. لەڕوانگەی ژیاریی و کۆمەڵایەتییەوە، ئەوانیتر یان بێگانەن، یاخود هەندەرانی و فەرەنگی یان غەریب و نامۆ.

لە ڕوانگەی سیاسیشیەوە (سیاسەت چ وەک زانستێک و چ وەک پیشە و پراکتیکێک)، خەڵک و ئەوانیتر لەسەر بنەمای (دۆست/ دوژمن ، هاوپەیمان/ نەیار، یان: یار/ ڕەقیب)ەوە پۆلێن دەکرێن.

لەگشت پرۆسەیەکی بەئەویترکردندا دوویاسای سەرەکی کاریان پێدەکرێت:

یەکەم: هیچ ئەویترێک بوونی نییە و نابێتە ئەویتر ئەگەر ئێمە هۆشیاریمان بە بوونی نەبێت[54]. ئەم یاسایە، فەرزی دەکات، کە دەبێت ئێمە ئەویتر بناسین و بابەتێک بێت بۆ هووشیاریی ئێمە. دیارە ناسینەکەی ئێمە و هووشیاریەکەمان لە چ ئاستێکدایە و چۆن بەدەستمان هێناوە، لێرەدا گرنگ نییە و دەشێت ئەو ناسینە سەراپا هەڵە و سەراپا وەهم و سەراپا خستنە پاڵ بێت.

دووەم: ئێمە ناتوانین هیچ جۆرە پەیوەندییەکمان بە ئەویترەوە هەبێت، ئەگەر لەو پەیوەندیەدا خۆمان نەکەینە «سەردەستە» و ئەویتریش بە «ژێر دەستە» یان خۆمان

[54] طاهر لبيب: *صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا اليه*. ص ١٠٣.

وەک «سـەرکەوتوو» و دانەنێـین و بەرامـبریش بـە «ژێـر کـەوتوو» لەقەڵەم نەدەین[**]. ئەم یاسایەش فەرزی دەکات، کە دەبێت ئێمە ئەویتر «بچووک» بکەینەوە تا خۆمان «گەورە» بکـەین، ئەویـتر «بـەتاڵ» بکەیـنەوە تـا خۆمـان «بتاوسێـنین»، ئەویـتر «بەپەراوێـز» بکـەین تـا خۆمـان بچـینە «چـەق» و «سـەنتەر»ـەوە. ئەویـتر «بێدەنگ» بکەین تا کو خۆمان ببینە تاکە قسەکەر.

ئـەنجامی ئـەم دوو یاسـایە بـەوە دێـتەوە کـە بگوتـرێ: پێویسـتە ئێمە بـۆ ناسـینی خۆمـان، ئەویتر لە هۆشیاریماندا «بەرهـەم بهێـنین»[*] و بیناسـین، بـەڵام ئەم ناسینە بۆ گەیشتن بـە حەقـیقەتی ئەویـتر نیـیە، بـەڵکو بـۆ سـڕینەوەی ئـەو حەقـیقەتەیەو هـەر لەبـەر ئەمـەش ناسـینەکەمان، یـاخود مەعـریفەمان لـە ئاسـت ئەویـتردا نابێـتە «مەعـریفەیەکی ئاڵوگۆڕکـەر *Communicative*»، بـەڵکو دەبێـتە مەعـریفەیەکی شـەڕانی و تێکدەر و شێوێنەر. بێگومان ئەمەش دژ و ناکۆکە لەگەڵ مەعریفەیەکدا کـە دەیەوێت ئەویتر ***بناسێ*** تا بتوانێت پـەیوەندی لەگـەڵدا دروستبکات. نـەک بیناسێ بۆسڕینەوەی. بـەم پێیـەش مەعـریفەمان بـە ئەویـتر هەمیشـە مەعریفەیە بە ئەویتری سـەربەخۆ و ئـازاد، چـونکە مەعریفە تەنیا ئەوکاتە دەتوانـێ ئاڵوگۆڕکـەر بێـت و ئەویـتر بناسـێ، کـە ئەویـتر وەکئەوەی لـەخۆیدا هـەیە، لە سەربەخۆیی و ئازادیی خۆیدا

---

[55] طاهر لبيب: *صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا اليه*. ص ١٠٣.

قـەبووڵ بکـات؛ نـەک بـیکاتە ئەویـتر وەکـئەوەی بۆخـۆی پێویستی پێیەتی.

**دوو جۆر بەئەویترکردن:**

هـەروەک چـۆن پرۆسـەی بەئەویـتر کـردن یاسـای خـۆی هەیـە و ئـەرکی مەعـریفە دەشێوێـنێ و ڕاسـتییەکان ئـاڵۆز دەکـات، ئـاواش دوو جـۆر بەئەویـترکردنمان هـەیـە کە دنیا و کۆمـەڵگا و کەسـەکان لەسـەر دوو ئاسـت پۆلێـن دەکـات و حوکمیان لەبارەوە دەردەکات:

یەکـەم: ***لەسـەر ئاسـتی نـاوەکی:*** ئەمـە ئـەو ئاسـتەیە لـە پرۆسـەی بەئەویـترکردن کـە تاکـەکان، یـان گـرووپەکانی کۆمـەڵگا لـەناو خۆیـاندا لێوەی دەڕواننە یەکتر. بۆ نموونە وەک ئـەو تێڕوانینەی دەوڵەمەندەکان لە ئاست هەژارەکاندا هەیانـە. یـان وەک ڕوانـینی شـارییەکان بـۆ گوندیـیەکان، یـاخود ڕوانـینی گـرووپە «تەندروسـت» و «عـاقل»ـەکان بـۆ کەسـانی «نـەخۆش» و «بـێ عـەقڵ»؛ یـان «شێـتەکان». لـەم تێڕوانینەدا «**ئەویـتر وەک کەسێکی نائاسایی و ناسرووشتی تەماشـای دەکرێـت**»[56]. ئەمـەش ئـەو بوارەیـە کـە بیرمـەندی فەرەنسـی میشێـل فوکـۆ لـە بەرهـەمەکانـیدا بـەقووڵی توێژینەوەی لەسەر کردوون...

---

[56] طاهر لبيب: *صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا اليه*. ص ٥٤.

دووەم: *لەسەر ئاستی دەرەکی*: ئەمەش ئەو ئاستی بەئەویترکردنەیە کە تاکەکانی، یان گرووپەکانی کۆمەڵگایەک، یاخود کۆمەڵگاکان بەگشتی لێوەی دەڕواننە تاک و گرووپ و کۆمەڵگاکانی تر. بۆ نموونە وەک تێڕوانینی مرۆڤی وڵاتانی پێشکەوتوو بۆ مرۆڤی وڵاتانی بەناو «جیهانی سێهەم». یا ڕوانینی «سپی پێستەکانی ئەمریکا» بۆ «ڕەشپێستەکانی دنیا». ڕوانینی «خۆرئاواییەکان» بۆ «خۆرهەڵاتییەکان»و بەوجۆرە... ئەمەش ئەو بوارەیە کە *ئیدوارد* سەعیدی فەلەستینی، بە بەکارهێنانی میتۆدی فۆکۆ، کاری تێدا کردووە و لە کتێبی ***خۆرهەڵاتناسی*** *(Orientalism)*دا بەرجەستەی کردووە.

ئەوەی لێرەدا شایانی وەبیر هێنانەوەیە، ئەوەیە کە هەردوو ئەم جۆری بە ئەویترکردنە، تەواوکەری یەکترین. بگرە بەئەویترکردن لەسەر ئاستی ناوەکی پێشمەرجە بۆ ئەویترکردن لەسەر ئاستی دەرەکی. تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایەی، تاک و گرووپە کۆمەڵایەتیەکانی دیکەی هەمان کۆمەڵگا بەئەویتر دەکەن، ئامادەییەکی باش وەدەست دەهێنن تا هەمان میکانیزمیش لە ڕوانینیاندا بۆ گرووپی کۆمەڵگاکانی تر بخەنە کار. ئەمەش لە مێژوودا هەردەم شێوەیەکی هەمەپەسەند بووە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری «ئێمە کێین؟» و لە ئەنجامی ئەمەیشەوە بەخشینی وێنەیەکی تایبەت بە ئەوانیتر کە لە ئێمە ناچن و نابێت لە ئێمە بچن. ئەوانیتر بۆیە مەترسین، یاخود بۆیە دەبێت وەک مەترسی

تەماشایان بکەین، چونکە وەک ئێمە نین و ئەوانەش کە وەکو خۆمان نین دەبێت دووژمنمان بن[57].

بۆیە، ئەوانەی وەکو خۆمان نین، ئەوانەن کە بەردەوام نەخشەی لەناوچوونمان دەکێشن و لەگەڵ نەیارەکانماندا هاوپەیمانێتی دەبەستن و لە خەونەکانماندا دەیانەوێ بمانکووژن. بەم پێیەش «ئێمە» هەردەم لە بەردەم مەترسی «ئەوان»دایە، ئەگەرچی بۆی هەیە ئەم «ئێمە» و «ئەوان»ـە لە بنەماوە دروستکراوی وەهمیی بن و لە واقیعدا هیچ بەرجەستەبوونێکیان نەبێت.

## کورتە مێژووی بەئەویترکردن

من لێرەدا بە شێوەیەکی سیستەماتیکی مێژووییانە بەدوای سەرەتاگە و ڕەگوڕیشەی ئەم دیاردەیەدا ناگەڕێم، بەڵکو تەنیا چەند نموونەیەک لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە دەهێنمەوە، تاکو لە پاشاندا یارمەتیمان بدەن بۆ قسەکردن لەسەر پرۆژەی بەعس بۆ بەئەویترکردنی کورد و بەدووژمنکردنی و دەرخستنی جیاوازیی ئەو پرۆژەیە لەگەڵ نمونەکانی دیکەی ناو هەمان مێژوودا.

---

57 ڕێبوار سیوەیلی: ***ئەنتەوە و حەکایەت***. سپیریز، کوردستان/ دهۆک، ٢٠٠٢، ل ١٥١–١٦٠.

بـــه ئەویـــترکردن لـــه کۆمـــەڵگا خـــاوەن کولـــتووره زارەکیەکاندا، واته ئەو کۆمەڵگایانەی کە هێشتا نووسینیان دانەهێنا بوو، لە ئەنجامی ترسەوە بووە لە بێگانە. ئەم کۆمەڵگایانە بە حوکمی ئەوەی لە گوشەگیری جوگرافی و گوشەگیری کولتووریدا دەژیان، زەینێکی مەند و داخراویان هەبووە و ئەمەش وایلێکردوون کە لە گۆڕان و شتی نوێ بترسن. هەروەها گوشەگیریە جوگرافیەکەیان ڕێگەی پێنەداون چێژ لە «هاوسێیەتی» و «پێکەوە بوون» وەربگرن و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی لە بەرامبەر بێگانەدا سڵبکەنەوە و هەست بە ترس بکەن بەچاوی بەدگومانییەوە تەماشایان بکەن. چونکە بێگانە بەوەی کە نوێیە و لە دەرەوە هاتووە، ئەوە هەڕەشەیەکە لەسەر شتە پیرۆز و نەریتییەکانی «ناوەوە»ی ئێمە، ئەو شتانەی لەسەریان ڕککەوتووین و بەپیرۆزمانکردوون و وەک یاسا پەیڕەویان لێدەکەین[58]. بۆیە دەتوانین بڵێین: ترسی کۆمەڵگا زارەکییەکان بۆتە هۆی پتەوکردنی پەیوەندییەکانی ناو خۆیان و لەهەمان کاتیشدا هاندەرێکە بۆ بەهێزکردنی پرۆسەی بە ئەویترکردن لەسەر

[58] بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

بارنز و بکر: ***تاریخ اندیشه اجتماعی. از جامعه ابتدایی تا جامعه جدید***. ت. ج. یوسفیان و علی ا. مجیدی. جلد اول، تهران، ۱۳۵۸، ص ۲۵-۲۸.

ڕێبوار سیوەیلی: (ئامادەکار) ***مێژووی هزری کۆمەڵایەتی***. زنجیرەی هزر و کۆمەڵ ژ.(۲)، ۲۰۰۳، هەولێر، ل ۱٦-۱۸.

ئاستی دەرەکی. لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵناسیانەوە هەتا یەکێتی گرووپ لەسەر ئاستی ناوخۆیی پتەو بێت، ئەوەندەش خۆی لە ئاست هەڕەشەی دەرەوەدا دەبینێتەوە. لەبەرامبەر ئەمەشدا پرۆسەی بەئەویترکردن و بە دووژمنکردن لە ئاست ئەوانیتردا بەهێز دەبێت.

لە یۆنانی کۆندا «ئەویتر» ئەو کەسە بوو کە بەشێوەیەکی بنەمایی جیاواز بوو لە «ئێمە». لەلای ئەرستۆ «بێگانە» ئەو کەسە بوو زمانی «ئێمە»ی نەدەزانی[59] و لە دەوڵەتشارێکی ترەوە یان لە جوگرافیایەکی دیکەوە هاتبوو و بە زمان و زاراوەیەکی دی دەئاخفی. پاشان بە تێکەڵبوونی یۆنانییەکان بە خەڵکانی تر (بۆنموونە لەگەڵ فارسەکان لە ڕێگەی جەنگەوە)؛ بێگانە ئەو کەسە بوو کە هەڵگری خوێنی ناپاکە و لێرەشەوە وشەی (بەربەر) بووە ئەو وشەیەی کە یۆنانەکان بە هۆیەوە وێنەی ئەویتریان دەهێنایە پێشچاوی خۆیان: غەیرە یۆنانی، نارەسەن، ناشارستانی، دڕندە و کۆیلە[60].

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، چیدی بە ئەویترکردن لەسەر بنەمای ڕەگەز و خوێن و لە ئەنجامی گوشەگیریی جوگرافی و کولتوورییەوە نەبووە، بەڵکو لە ئەنجامی پێکدادان و شەڕ و لەسەر بنەمای ئایینییەوە بووە: ئیسلام و مەسیحیەت،

---

[59] طاهر لبیب: *صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا الیه*.ل ٥٤

[60] Politikns Forlag: Nudanskordbog I. 13 udgave, 2 oplag 1987, P. 84.

دوو ئاینی تاک خودایی، وەک «ئەویتر» وێنای یەکتریان دەکرد[61].

لەو کاتەشەوە کە سورپێستەکان لەلایەن ئەوروپاییە سپی پێستەکانەوە «دۆزرانەوە» و لەمەشدا (کریستۆفەر کۆلۆمبۆس) بووە قارەمان(١٤٩٢)، ئەوە سورپێستەکان، کە خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بوون، وەک بێگانە و ئەویتر وێنا دەکران. ئەمەش لە لایەن ئەو کەسانەوە کە خۆیان کۆچەر بوون و کۆچیان کردبوو بۆ مەڵبەندی ئەوەی یەکەمیان[62].

پرۆسەی بەئەویترکردن لەسەدەی بیستەمدا گۆڕانی نەوعی بەسەردا هات و هەردوو بزاڤی فاشیزم لە ئیتالیا و نازیزم لە ئەڵمانیا؛ یەهوودیەکان و قەرەچ و گرووپە غەیرە ئەوروپاییەکانیان وەک «ئەویتر»ی خۆیان وێنا کرد. گۆڕانە نەوعییەکەش لەوەدا بوو، کە چیدی ئەم بەئەویترکردنە هەر تەنیا لەسەر بنەمای ڕەگەز و خوێن و ئەو خەسڵەتانەوە نەبوو، وەکئەوەی لە یۆنانی کۆن و سەدەکانی ناوەندا باو بوو، بەڵکو لەسەر بنەمایەکی زانستییەوە بوو. ئەوە پسپۆر و پزیشک و دەروونناس و مرۆڤناس و کۆمەڵناس و دێرینەناسان بوون کە شەرعیەتیان

---

[61] طاهر لبيب: *صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا اليه*. ص ٦١.

[62] مهرزاد بروجردي: *روشنفكران ايرانى و غرب*. ت. ع. شيرازي. تهران ١٣٧٨، ص ١٤.

دەدا بە بچووکی و ناپاکیی یەهوودیەکان و ڕێگای لەناو بردنیان بۆ نازی و فاشیەکان تەخت دەکرد[63].

جۆرێکی تری، یان قۆناغێکی دیکەی بەئەویترکردن لە ئەنجامی و کۆچ و بانگهێشتی ژمارەیەکی زۆر کرێکار لە دنیای ئیسلام و خۆرهەڵاتەوە بۆ وڵاتە ئەوروپییەکان، لەپاش شەڕی دووەمی جیهانییەوە، (بەتایبەتی لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا و وڵاتانی ئەسکەندەنافی) دەستیپێکرد. ئەم وڵاتانە کە لەئەنجامی وێرانکارییەکانی جەنگەوە پێویستیان بە هێزی کاری بێگانان هەبوو بۆ بیناکردنەوەی کۆمەڵگا دارماوەکانیان، دەرگایان بەسەر هەزاران کرێکاردا ئاوەڵاکرد. وەلێ پاشنەوەی ئەو کۆمەڵگایانە هاتنەوە سەرخۆیان، ئەمجا کەوتنە بەرهەمهێنانی وێنای تایبەت لەسەر ئەو بێگانانە و زەمینە سازکردن بۆ ناردنەوە و دەرکردنیان. ئەمە جگەلەوەی جەنگی نێوان عێراق/ئێران لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم و ئاڵۆزیی سۆماڵیا و شەڕی یۆگسلافیا و پێکدادانی نێوان هۆزەکانی هیتی و توتوو لە نەوەدەکانی هەمان سەدەدا، بووە هۆی ژمارە زۆری پەنابەران لە وڵاتانی ئەوروپایدا. بەمجۆرەش ئەمجارەیان لە پەنابەران «ئەویتر»ی ئەوروپایی هاتە بەرهەم بۆئەوەی هاوسەنگی ببەخشێتەوە بە ناسنامەی قەیراناویان.

---

[63] ڕێبوار سیوەیلی: *نەتەوەو حەکایەت*، ل ١٥٧-١٥٨.

## چوارەم: ڕژێمی بەعس:
## لە بەنەوەیترکردنەوە بۆ بەدووژمنکردنی کورد

ناوی تەواوی ئەم ڕژێمە بریتییە لە «حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی». ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرنجە مانای وشەی «بەعس»ـە، کە بە واتای *هەستانەوە*، یان *سەرهەڵدانەوە* یاخود زیندووبوونەوە، دێت و ئەو پەیوەندییە قووڵە و لکانە توندەیەتی بە وشەی «عەرەب»ـەوە. **حیزبی بەعس حیزبێکە بۆ هەستاندنەوە و بووژاندنەوەی عەرەب و دروستکردنەوەی «یەکێتی» لەناو ئەم میللەتەدا.**

لە پرۆگرام[٦٤] و ئەدەبیاتی ئەو حیزبەدا ئاماژە بەوە کراوە کە **«عەردی باو و باپیرانی عەرەب یەکەیەکی سیاسی و ئابووریی دابەشنەکراوە»**[٦٥]. هەروەها لە دەقی *پرۆژەی دەستووری کۆماری عێراق*یشدا نووسراوە: **«عێراق بەشێکە**

---

[64] شبلي العيسمي: *حزب البعث العربي الاشتراكي* ١، مرحلة الاربعينات التاسيسية ١٩٤٠-١٩٤٩. دار الطليعة للطباعة و النشر، بيروت ١٩٧٤، ص ١١٧.

[65] حزب البعث العربي الاشتراكي، القيادة القومية: *المنهاج الثقافي المركزي*، كتاب الاول، بغداد ١٩٧٧، ص ٣١.

لــه نیشــتیمانی عەرەبی و لە پێناوی وەدیهێنانی یەکبوونێکی گشتیی عەرەبیدا تێدەکۆشێت»[٦٦].

بـەم پێیەش بـەعس خـۆی بـە بەرجەسـتەکەری ناسـنامەی عـەرەب پێناسـە دەکـات و تێـڕوانینی ئـەو حیزبە بۆ جیهان و کۆمـــــەڵگاکانی تـــــر، تێڕوانینێـــکی نوێـــــنەرایەتیکراوی عەرەبیانەیە. واتـە تێڕوانینێـکە هـەوڵدەدات عـەرەب، یاخود ڕاسـتتر وایـە بگوتـرێ: *تێڕوانینێکی تایبەت لەسەر عەرەب* لە سـەرووی هــەموو شتێـکەوە دابنێـت و قـایـیل نیــیە بــەوەی غەیـرە عـەرەب، تێـکەڵ بـە عـەرەب بکـات و بـوار نـادات بـە ئەوانیتر تا وەک عەرەب بن و لە ئاستی عەرەبدا بن.

بۆیـــە حـــیزبی بـــەعس لەگـــەڵ دامـــەزراندنی خۆیـــدا تێڕوانینێـکیش لەسـەر غەیـرە عـەرەب بەرهەمدەهێنێ، کە لە قۆنـاغی جـیاواز جیاوازدا ئـەو تێـڕوانینە ئاراسـتەی لایـەنی جـــیاوازیش دەکـــات: «ئیمپریالـــیزم، زایۆنـــیزم، فورســـی مـەجوس» و پاشـانیش کـورد و نەتـەوە و گـرووپەکانی تـری نـاو عێراق و ئـەو "عەرەبە خیانەتکارانەش" کە خیانەتیان بە عەرەبایەتی خۆیان کردووە (وەک کوێتی و سعودییەکان)!

ئەگەرچـی «کـورد» هەمیشە لە مێژووی عێراقدا ئەو لایەنە ئامادەیـە بـووە بـۆ ئـەوەی بکرێـتە «ئەویـتر»، بـەڵام تەنـیا لەسـەر دەسـتی ڕژێمی بەعسـە کە پرۆسەی بە «ئەویترکردن»

---

[٦٦] *نص مشروع لدستور الجمهورية العراقية*. دار الثورة للصحافة و النشر، دون سنة الطبع، ص ٥.

دەبێـــتە پرۆســـەی «بەدوژمـــنکردن». بـــە مانایـــەکی دی: **«بەعســیزم ئــەو سیســتەمەیە کە بوونی کورد لەناو جەستەی کۆمــەڵگا سیاســییەکەی(دا)، وەکــی هۆکارێــکی نارەحەتکەر و شێوێـنـەر تەماشـا دەکـات و لــە وێنەوە وێنەی بێگانەیەکی پێدەبەخشێت کە لە ڕووی سیاسییەوە دەبێت بە دووژمن»**[67].

بـەعس بۆ ئەوەی لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانی قەیراناوی خۆیـدا وەڵامـی پرسـیاری «مـن کێـم؟» بداتــەوە، دەبــوو «ئەویـتر» دابهێـنێ و وێـنەی خۆی پێببەخشێ وەک نەیارێک. بۆیـــە ئەگـــەر وێـــنەی «ئیمپریالـــیزم» یـــان «فورســـە مەجووســـەکان» وێـــنەیەکی ناجێـــگیرە و یەکەمـــیان بـــە کشـــانەوەی ئیمپریالـــیزمی داگیرکـــەر و دووەمـــیان بـــە کۆتاییهاتنی شـەڕ لەگـەڵ کۆمـاری ئیسلامیی ئێران، کۆتـایی پێدێـت و کـاڵ دەبێتەوە، ئـەوە وێـنەی کورد وێڕای مسوڵمان بوونەکەیشـی، لـە زەیـنی بەعسییەکاندا، وێنەیەکی جێگیرە و هـەتا یـەک کـورد بمێنێـت گـۆڕانی ئیجابی بەسـەردا نایـەت. بـەمجۆرەش وەک شـاراس فـەتاح جـوان بـۆی چـووە، بـەلای بەعســییەکانەوە؛ کـــورد وەک بوونەوەرێـــک ئەگەرێـــکی ترســـناکن: **«ئەگەرێـــکی واقـــیعین بۆئـــەوەی لـــە هـــەموو چرکەساتێـکدا بـبن بــە دوژمنی پرۆژەی بەعس. بەعس دەبێتە ماڵێـک کـە بەتـەنها جێـگەی ئەو کەسانەی تێدا دەبێتەوە کە**

---

[67] شاراس فـەتاح: *هەشـت قۆنـاغ لـە سیستمێـکی کوشتن و سڕینەوەدا*، گۆڤاری ڕەهەند ژ. ٧، ١٩٩٩، ل ١٣٩.

بـەرگی دۆسـت لەبـەر دەكـەن»[68]. ئەگەرچی پێویستە لـەم بەكارهێنـانەدا مانایـەكی تایـبەت بـۆ ئیسـتعارەی «مـاڵ» و «دۆسـت» لەبەرچـاو بگـرین، چـونكە بـەعس لەهـەر ساتەوەختێكدا ئامادە بوو ئەو ماڵە بكاتە دۆزەخ، تەنانەت بـۆ نزیكـترین دۆسـت و ئەندامەكانیشی، وەكـئەوەی بەسـەر زاواكـەی سـەددام حسێـن و سـەدان بەعسـی و هـەزاران سـەربازی عێـراقی هـات، ئەوكاتانـەی سـووكە گومانێـكیان لێـدەكرا. ئەمـە جگەلـەوەی بـەعس كەسـی وەك دۆسـت پێقەبووڵ نەدەكرا و ئەگـەر ئەمەیشی قـەبووڵ كـردبا؛ تەنیا دوای ئـەوە بـوو كـە بونـیادە ئینسانیەكەی لێبەتاڵ بكاتەوە و لەسـەر بـنەما پەروەردەیـیەكانی خۆیـەوە، سـەرلەنوێ وەك بەعسییەك؛ بەرهەمی بهێنێتەوە[69].

ئێستا بـەر لـەوەی بێمە سـەر باسكردنی ئـەو قۆناغانـەی كە تێـڕوانینی بـەعس بەرامبەر بە كورد دیاری دەكات، با بزانین بۆچـی مسـوڵمانبوونی كـورد بـەلای بەعسـییەكانەوە هـیچ بایەخێـكی سـەبارەت بـە جێـگیربوونی وێـنەی ئـەوان وەك «ئەویترێكی هەمیشەیی»، نییە؟

---

[68] ئاراس فەتاح: *«هەشت قۆناغ لە سیستمێكی كوشتن و سڕینەوە»*، ل ١٤١.

[69] صـدام حسـین: *حـول كتابة التاریخ*. دار الحریة للطباعة، بغداد ١٩٧٩. ص ١٣ و بەرەو دوا.

بەعس رژێمێکی ڕەگەز پەرست بوو. ئیسلامیش ئامرازێک بوو بە دەست بەعسییەکانەوە بۆ وەشاندنی ڕەمبی ڕەگەزپەرستانەی خۆیان. لە هزری بەعسدا، ناسیۆنالیزمی عەرەب لە ئیسلام لە پێشترە، چونکە بەلای بەعسییەکانەوە ئیسلام وێنەیەکی *ژیانی پەیامبەرە* و ژیانی پەیامبەریش *کورتکراوەی ژیانی عەرەبە*[70]. هەروەها ئەوان پێیانوایە ئیسلام ڕووداوێکە **«پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە ژیانی عەرەبەوە»** و **«نومایەکی ڕاستگۆیانەی ڕەمزیی و کامڵە لەسەر سرووشتی جەوهەریانەی عەرەب»**[71]، بەڵام میرات و کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلام لە هەمان کاتیشدا بەها و نرخە کولتوورییەکانی عەرەب پێکدەهێنن[72]. بۆیە ئیسلام بەلای بەعسییەکانەوە لەبەر ئەوە ئایینێکی مەزنە، چونکە توانیویەتی کولتووری (عەرەبیەت/عرووبە) لەبەشێکی گەورەی دنیادا بڵاوبکاتەوە.

میشێل عەفلەق لە کتێبی «في سبيل البعث»دا، کە پاشتر بووە سەرچاوەی ڕۆحیی بەعسییەکان؛ پێیوایە: ئیسلام لە دایکبووی ژیاری عەرەبە و لە دایکبوونی پێغەمبەر بە لە

---

[70] میشیل عفلق: *في سبيل البعث*. دار الطليعة، بيروت ط. الحادية عشر، ص. ١٢٥.

[71] میشیل عفلق: *في سبيل البعث*. ص ١٢٤.

[72] میشیل عفلق: المصدر السابق، صص. ٢٠١-٢٠٨ و ٢٠٩-٢١٧.

دایكبوونی «عەرەبیزم» ناو دەبات[73]. لە شوێنێكی دیكەدا گوتویە: **«محەمەد بەرجەستەكەری هەموو عەرەبانە، لێگەڕێن لە ئەمڕۆشدا هەموو عەرەبێك ببێتە محەمەدێكی تر»**[74].

لەم تێڕوانینەدا، لەلایەكەوە هەوڵدانێكی جیدیی هەیە بۆ تێهەڵكێشكردنێكی بەعسیانەی نێوان چەمكی ئایین و چەمكی سیاسەت و لەوێشەوە سیاسیاویكردنی دین؛ لەلایەكی تریشەوە هەوڵدەدرێت ئایین ببەستێت بە ڕەگەزەوە. هەر ئەم تێهەڵكێشكردنەیشە وادەكات بەعسییەكان بەچاوێكی نزم تەماشای ئەوانە بكەن كە وەك غەیرە عەرەب مسوڵمان بوون. چونكە ئەوەی شایەتمان بە ئایینی ئیسلام دەهێنێت، شایەتمان بەناو زمانێكدا دەهێنێت، یاخود بە زمانێك دەیهێنێت كە زمانی عەرەبە و بە پەیامبەرێكی دەهێنێت كە بەرجەستەكەری عەرەبایەتییە و هەڵبژاردنی عەرەبیش بۆ بڵاوكردنەوەی ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فەزیلەتانەی كە

---

[73] ئەم قسەیەی میشێل عەفلەق لەگەڵ ئەم ڕایەی (شافیعی)دا بەراورد بكە، كە *رضوان السید* لە كتێبەكەیدا بەمجۆرە نوسیویەتیەوە: «فبقدر ارتباط العرب بالاسلام ارتبط الاسلام بهم. فليست الهوية الاسلامية هوية طائرة، بل انها مرتبطة بالعرب و العربية ارتباطا لا تنفصم عراه. فهم الاسلام و الاسلام هم لو لسانهم». نقل عن: الشافعي: *الرسالة*. تحقيق: احمد شاكر ١٩٣٩م، ص٤٢، رقم١٣٨.
بڕوانە: رضوان السيد: *مفاهيم الجماعات في الاسلام*(دراسات في السوسيولوجيا التاريخية للاجتماع العربي الاسلامي). بيروت ١٩٩٣، ص ١٢٨.

[74] ميشيل عفلق: *في سبيل البعث*. ص ١٢٦.

تەنیا لە عەرەبدا بە کەماڵ گەیشتوون[٧٥]. کەواتە شایەتمان هێنان و مسوڵمانبوونی ئەوانیتر بۆ ئەوەیە لەسایەی پێگەیشتن و کەماڵی فەزیلەتەکانی عەرەبدا، کەموکورییەکانی خۆیان پڕ بکەنەوە. بەخۆڕایی نییە بەعسییەکان بڕوایان وایە: ئیسلام لە نەتەوەی عەرەبدا نەبێت ئیمکانی سەرهەڵدانی نەبوو، بۆیە **«دەبێت تەنیا عەرەبەکان لەوڵاتی خۆیاندا سەرگەورە و بەهێز بن»**[٧٦].

وەک دەبینین دوای ئەم تێهەڵکێشکردنە بەعسیانەیەی نێوان ئاین و ڕەگەز و بەخشینی وێنەیەکی ڕەگەزپەرستانە بە ئایین، مسوڵمانبوون بەس نییە بۆ ئەوەی عەرەبی بەعسی، بەرامبەرەکەی وەک «ئەویتر» تەماشا نەکات. مسوڵمانبوون لە ڕوانگەی بەعسییەکانەوە، تەنیا ئیعتیرافکردنێکە بە گەورەیی عەرەب و خۆ بچووکردنەوەیە لە ئاست «من»ی گەورەی عەرەبدا، هەڵبەت بەو تێگەیشتنەی بەعسییەکان بۆ چەمکی عەرەب هەیانبوو.

لە هەموو ئەمانەوە ئاشکرا دەبێت، کە بەعسییەکان هەرگیز نەیانویستووە و لە پرۆژەیاندا نەبووە کورد بەعەرەب بکەن، بەڵکو ویستوویانە لە کورد ئەویتری عەرەببوونێک دابتاشن کە بۆخۆیان بڕوایان پێی هەبوو. هەڵبەت مێژووی بەعەرەبکردنی کورد وەک زەمینە

[75] میشیل عفلق: *في سبيل البعث*. ص ١٢٧.

[76] میشیل عفلق: *في سبيل البعث*. ص ١٢٨.

ڕەخساندنێک بۆ بەئەویترکردن، وەکو لە بەشەکانیتردا لێیدوام، پێشتر لەلایەن زانا و مێژوونووس و گەڕیدە عەرەبەکانەوە، دەستپێکردبوو؛ بەلام ئەوە تەنیا بەعسییەکانن کەوێنەی کورد دەکەنە وێنەی دووژمن، هەربۆیەش بەعسییەکان بەرجەستەکەرێکی مودێرنی عەرەبایەتین لە ئاستی سیاسی وئایدیۆلۆژیەتیکی ڕەگەز پەرستانەدا.

لێرەدا پێویستە ئەو گریمانەیە دووبارە بکەمەوە کە پێشتر قسەمان لەسەر کرد و تیایدا گوتمان: بەعەرەبکردنی بەرایی هۆکاری تایبەتی خۆی هەبوو کە ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئایین و خۆبەعەرەبکردنیش یەکێک بوو لە ئەنجامەکانی. هەر بەهەمان شێوەش دەتوانین بڵێین: بەئەویترکردنیش پێشزەمینەیەکی مێژوویی خۆی هەیە کە ڕەگ و ڕیشەکەی دەچێتەوە ناو کولتووری ناسیۆنالیزمی عەرەبی، بەلام هەر بەئەویترکردنیشە کەدەبێتە پێشمەرج بۆ بەدووژمنکردن (کە یەکێک لە ئەنجامەکانیشی ئەنفال و گۆڕە بەکۆمەڵییەکان و کارەساتی هەڵەبجە بوو)، ئەمەش دوای ئەوەی بەعسییەکان سەرلەنوێ مێژووی ئیسلام و مێژووی گەلی عەرەبیش بەپێی پرنسیپەکانی خۆیان دادەڕێژنەوە؛ تا تێگەیشتنێکی بەعسیانەی لەسەرەوە بینا بکەن. لەمبارەیەوە سەدام حسێن بە ڕوونیی دەڵێت: **«ئێمە پێویستیمان بەوە نیە مێژوو تەزویر بکەین، یان دروستیبکەین لە پێناوی ئەوەی خوێندنەوەیەکی بەعسیانەی بۆ بکەین،**

بـەڵکو ئێـمە پێویستیمان بەوە هەیە بە شێوەیەکی بەعسیانە لێی تێبگەین.»[77].

کەواتــە ئەگــەر لێــبووردەیی بەخــەرج بدەیــن و بڵێــین: بەعەرەبکـردن و بەئەویـترکردن هێشـتا جـۆرێ لـە نەرمـیی تێـدایە چـونکە لـەناو خـەیاڵ و یـادوەریدا وەک "ئینسـان" مامەڵـە لەگـەڵ بەرامـبەردا دەکـات، ئـەوە بەدووژمـنکردن، شـەڕکردن و لەناوبـردنی ئینسـانییەتی بەرامـبەرە لەسـەر عـەردی واقـیع و سـڕینەوەیەتی بەشێـوەیەکی پراکتیکـیانە. بەواتایـەکی دی: ئەگـەر گوتـاری ناسـیۆنالیزمی عـەرەبی بەرپرسـیار بێـت لـەوەی لـەناو کەلـتووری عەرەبـیدا زەمیـنە خۆشـبکرێ بـۆ بەعەرەبکـردن و بەئەویـترکردنی کورد، ئەوە بەعسـییەکانن کـە ئـەو پـڕۆژە ناسیۆنالیسـتیە دەکەنـە پـڕۆژەیەکی ڕەگەزپەرسـتانە و لەسـەر عـەردی واقـیع جێبەجێـی دەکـەن. وەلـێ بـەبێ وێـناکردنەکانی کولـتووری عـەرەبی و عـەقڵ و مێـژووی عـەرەبی بـۆ کـورد، بـەعس نـەیدەتوانی پڕۆژە کۆکوژی و ئەنفالیەکانی جێبەجی بکات و ئەم هەڕەشەیە لە سەر خۆی لابەرێت.

بۆیـــە لـــەگوتاری ڕگەزپەرســـتانەی بەعســـدا، ئـــەو مەعریفەیەی کە کورد وەک مەترسی و هەڕەشە وێنا دەکات، مەعـریفەیەک نـیە بـیەوێ حەقـیقەتی کـورد بناسـێ، بـەڵکو مەعـریفەیەکە لــە ئــەنجامی عەقڵانییەتێــکی وێــرانخوازی

[77] صـدام حسين: *حول كتابة التاريخ*. ص ٢٣.

پرۆسەی بەئەویترکردنی کوردەوە بەرهەمهاتووە. عەقلانییەتێکی ئەوتۆ، کە سەراپای ناسیۆنالیزمی ڕەگەزپەرستانەی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی داگیرکردووە و هەر بەپشتیوانیی ئەو عەقلانییەتەش بەعسییەکان مرۆڤی کۆمەڵگای عێراقی و عەرەبییان گۆشکرد.

بەعسیەکان بەم وێناکردن و بە پشتیوانی ئەو مەعریفەیە ڕووبەڕووی کورد دەبوونەوە و بەو پێیەش جگە لە شێواندن و سڕینەوەی مێژوو، ڕەچەڵەک و کولتووری کورد وەک دوژمنێک، نەیاندەتوانی لەگەڵ ئەم میللەتە «مسوڵمانبووە»دا پەیوەندییەکیان هەبێت.

**نمونەی کوردناسیی بەعسیەکان:**

ئەگەر مەعریفەی بەعسییەکان بۆ تێگەشتن لە حەقیقەتی کورد نەبێت، ئەوە کوردناسییەکیش کە ئەو مەعریفەیە بەرهەمی هێناوە، کوردناسییەکی پێچەوانەو شێوێنەرە و ئامانجی ئەوەیە هەموو متمانە بەخۆبوونێک لەم میللەتە بستێنێتەوە. هەر بەڕاستیش بەعسییەکان کاریان بۆ ئەمە کردووە و ویستوویانە ناسنامەی کوردی لە بناخەوە هەڵبوەشێنن و کورد لە شوێنێکدا تێکبشکێنن کە هەستانەوەی ئاسان نەبێت. یەکێک لەو بەرهەمانەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکراوە و نمونەیەکی بەرجەستەی کوردناسیی بەعسییانە پێکدەهێنێت، بەرگی سێیەمی

کتێبەکەی «دکتۆر *ناجی مەعرووف*»ە، کە مامۆستای ژیاری عەرەبیی زانکۆی بەغدا و ئەندامی کۆڕی زانستی عێراق و ئەندامی کۆڕی زمانی عەرەبییە لە دیمەشق. (ئیدی پێویست بەوە ناکات باس لە پێگە حیزبییەکانی بکەین)[78].

هەڵبەتە بێهۆ نییە من لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەم کتێبە بە نموونەی کوردناسیی بەعس دەهێنمەوە، چونکە لە ڕێگەی ئەم نموونەیەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە چۆن ئەم کوردناسییە بە نییەتێکی بەعسیانەوە مێژوو دەخوێنێتەوە و لەهەمان کاتیشدا پەیوەندییەک لەگەڵ پرۆژەی بەعەرەبکردنی سەرەتادا، کە ئەو هەمووە سەری خوێنەرم پێوە هێنشاند، دروستدەکات. لەلایەکی تریشەوە، دەڵێی ئەم کتێبە دەقاودەق بۆ وەدیهێنانی ئەو قسەیەی سەدام حسێن نووسراوە کە تیایدا داوای دەکرد: *ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە بەشێوەیەکی بەعسیانە لە مێژوو تێبگەین*، نەک *مێژوو تەزویر بکەین*، کە هەڵبەت ئەمە درۆیەکی گەورەی بەعسییەکان بوو!

لەڕاستیدا چیدی بەعسییەکان، بە پێچەوانەی عەرەبە مسوڵمانەکانی بەرین، نایانەوێ و نەیاندەویست کورد بخەنە ناو قەفەسە ئاسنینەکەوە و دەستەمۆی بکەن و خودی خۆی لەبیر ببەنەوە. بەڵکو پرۆژەی بەعسییەکان، چ لەڕووی

---

[78] د. ناجي معروف: *عروبة العلماء المنسوبين الى البلدان الاعجمية في بلاد الروم و الجزيرة و شهرزور و الربايجان*. الجمهورية العراقية، وزارة الثقافة، دار الحرية للطباعة ١٩٧٨ ج ٣.

تیۆری و چ لەسەر ئاستی پراکتیکی، ئەوە بوو قەفەسە ئاسنینەکە بتویننەوە، نەک هەر بۆ تێگەیشتنێکی بەعسیانە لە مێژوو، بەڵکو بۆ تەزویرکردنی مێژوو و بۆ دروستکردنی مێژوویەکی بەعسیانەش لە داهاتوودا تا بەهۆیەوە ئینکاریی بوونی کائینێک بکەن بەناوی کورد.

دکتۆر ناجی مەعروف، بەپێی تێگەیشتنە تایبەتییەکەی بۆ مێژوو، لەسەرەتاوە دەیەوێت زۆربەی ئەو ڕێگایانە دابخات کە ئەگەری بوونی کورد لەسەر جوگرافیایەک دەسەلمێنن. ئەو پێیوایە دوای ئەوەی کە نفوزی عەرەبیش (لەو شوێنانەی کە ناوچە کوردییەکانن) نەما و دەسەلاتی عەرەبی لاواز بوو، کەچی هێشتا و هەتا ئێستاش (مەبەستی ساڵی نووسینی کتێبەکەیەتی: ١٩٧٨) پاشماوەکانیان لە هەموو شوێنێک ماون[٧٩]. وەک ئاشکرایە ئەم تێگەیشتنە ڕێگە خۆشکردنێکە تا نووسەر پێمان بڵێت: ئەو کەس و زانایانەی لە کتێبەکەیدا باسیان دەکات، دواجار عەرەبن و پرۆژەی ئەویش بریتییە لە زیندووکردنەوەی ڕەچەڵەکی ئەوان و ڕزگارکردنیان لەو ڕەچەڵەکە ناعەرەبیانەیەی دراوەتە پاڵیان و ئەمەشی لە ناونیشانی کتێبەکەیدا بەرجەستە کردووە.

---

[٧٩] د. ناجي معروف: *عروبة العلماء المنسوبين الى البلدان الاعجمية في بلاد الروم و الجزيرة و شهرزور و اذربيجان*. ج٣، ص ٨.

هەرچی سەبارەت بە بنەچە و ڕەچەڵەکی کوردانیشە، ئەگەرچی نووسەر لە ئێستادا دەژی، یان نووسینەکانی نزیکن لەسەردەمی ئێستاوە، کەچی هێشتا هەر پشت بە نوسینی مێژوونووسە عەرەبە دێرینەکانی وەک «ابن حەوقل، مەقریزی و مەسعودی» دەبەستێت و بە عەرەبیان لەقەڵەم دەدا[80]، مەسەلەیەک، کە تەنانەت ئەوانیش بەتەواوی دڵنیا نەبوون لەو زانیاریانەی بۆ هەمان مەبەست کۆیانکردوونەتەوە و ڕیوایەتیانکردوون؛ بەتایبەتی مەقریزی.

وەک نمونەیەک بۆ عەرەببوونی کورد لە تێگەیشتنە بەعسیانەکەی مەعروفدا و وەک هەوڵدانێکیش بۆ تەزویرکردنی مێژوو، نمونەی هۆزی «گەلاڵیەکان/جلالیون» نمونەیەکی بەرجەستەیە. ئەو دەیەوێت بیسەلمێنێت، ئەم هۆزە کوردییەی لە خۆرهەڵات و باشووری کوردستان دەژین، ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ «عبد کُلال» کە پادشایەکی (حمیری)یەکانی یەمەنە و لەسەرچاوەکاندا بە «العرب البائدە» واتە بە عەرەبە لەنێوچووەکان؛ ناویان دەبرێت![81]، کە بێگومان ئەم ئاماژەدانە هەر ئاوا بێگوناهانە نییەو گەرەکییەتی بەهۆیەوە پێمان بڵێت: بەپێی لۆژیکی

---

[80] د. ناجي معروف: *عروبة العلماء المنسوبين الى البلدان الاعجمية في بلاد الروم و الجزيرة و شهرزور و اذربايجان*. ج. ٣، ص ٩٧.

[81] هەمان سەرچاوە، ج ٣، ص ١٠٠.

مێژووییانەی بەعس دەبوو ئەم هۆزە وەک نەژادە لەناو چووەکەیان، لەناو چووبان.

شتێکی دیکەی سەرنجڕاکێش لە کتێبەکەی دکتۆر ناجی مەعروفدا، ئەو هێرشە توندەیەتی بۆسەر مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، وەرگێڕی شەرەفنامە بۆ سەر زمانی عەرەبی[82]. عەبباس بە توندی ڕەخنە لە مەلا جەمیل دەگرێت و لەو بڕوایەدایە هەرکەسێ وەرگێڕانە عەرەبییەکەی شەرەفنامە بخوێنێتەوە، بەهەڵەدا دەبرێت بەوەی ئەو میرنشینانەی شەرەفخانی بەدلیسی باسیکردوون، کوردن. لەکاتێکدا بە ئیدیعایەی نووسەر و هەر بە پشتبەستن بە بەدلیسی خۆی، کە لەسەردەمی بەر لە پەیدابوونی ناسیۆنالیزم کتێبەکەی نوسیوە، ئەو هۆزانە عەرەبی ڕەسەنن[83].

لە دیارترینی ئەو میرنشینانەی کە مەعروف لەو بڕوایەدایە بە ڕەچەڵەک عەرەبن، دەتوانین میرنشینی سۆران، بادینان و هەکاری ناو بەرین[84]. ئەمجا هەر بەمەشەوە ناوەستێ و کۆتایی ڕەخنەکانی لە مەلا جەمیل بەوە دەهێنێتەوە، کە بڵێت: ئابەمجۆرە ئەو کتێبەی وەرگێڕ (واتە مەلا جەمیل) پێیوایە لەبارەی مێژووی میرنشینە

---

[82] کە هەر بەعسیەکان بۆخۆیان لە بەغدا بەشێوەیەکی کوشتیان.

[83] لەبارەی ڕەخنەکانی د. ناجی معروف لە مەلا جەمیل بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ص ١١٠-١١٢.

[84] د. ناجي معروف: *عروبة العلماء المنسوبين الي البلدان الاعجمية في بلاد الروم و الجزيرة و شهرزور و اذربايجان*. ج. ٣، ص ١١٢-١١٣.

کوردییەکانەوەیە، لەواقیعدا لەبارەی میرنشینە عەرەبییەکانی باکوری عێراقەوەیە[85]. ئەم جورنەتە لە شێواندنی مێژوودا تەنیا لە کەسێک دەوەشێتەوە، هەمان تێگەیشتن و ڕقی لە مرۆڤی کورد هەبێت، کە جەللادێک لە بەندیخانە و ئەنفالەکاندا هەیبوو.

وەلێ نووسەر هەر بەمەشەوە ناوەستێ و کۆمەڵێ کەسایەتی ناوداری کورد لەناوچەی هەولێر و شارەزوور و ئامێدیش بە ڕەچەڵەک دەباتەوە سەر عەرەب، یان هەر لە بنەماوە بە عەرەب لەقەڵەمیان دەدات، لەوانەش: شێخ عودەی کوڕی موسافیری هەکاری[86]، مەولانا خالیدی نەقشبەندی[87] و شێخ مارفی نۆدێیی[88].

دواجار تێگەیشتنە بەعسیانەکەی مەعروف بۆ مێژوو، وای لێدەکات حوکمێکی کۆمیدیانەی وا دەربکات، کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا نمونەی دەگمەنە. ئەو دەڵێت: هەرکەسێک نازناوی "شەریف" بێت، یان "سەیید" بێت، لە بنەچەدا عەرەبە (جا لەهەر تیرە و هۆز و بنەماڵەیەکی عەرەب بێت)[89].

---

[85] د. ناجي معروف: *عروبة العلماء المنسوبين الى البلدان الاعجمية في بلاد الروم و الجزيرة و شهرزور و اذربيجان*. ج. ٣، ص ١١٦.

[86] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٤٠.

[87] هەر ئەو سەرچاوەیە، لاپەڕە ٢٠٢-٢٠٣

[88] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٠٤-٢٠٥

[89] هەرئەوێ، ج. ٣، لاپەڕە ٢٦٦.

هەموو ئەم پرۆژەیە و پرۆژەی دیکەی لەم بابەتە بە پشتبەستن بە مەعریفەیەکی ڕەتکەرەوەی شێوێنەر، کوردناسیی بەعسییەکان پێکدەهێنێت. ئەم کوردناسییە لەسەرێکەوە خۆراک لە سەرچاوە کۆنەکان وەردەگرێت (بێ گوێدانە شوێن و کاتی بەرهەمهێنانیان و ماناکانی بەعەرەبکردنی بەرایی)، کە بەعەرەبکردن ئامانجیان بوو، لەسەرێکیشەوە خزمایەتی لەگەڵ پرۆسەی خۆبەعەرەبکردنی کورداندا دەبەستێ و ئەو «نەزانییە»ی لەناو ئەو پرۆسەیەدا بەرهەمهاتووە، هەڵدەگێڕێتەوە بۆ «حەقیقەتێک» کە گوایە کوردەکان لەبارەی خۆیانەوە گوتویانە و نووسیویانە. هەر لێرەشەوەیە کە مەعروف دەتوانێت بڵێ، شەرەفنامە مێژووی میرەکانی کورد نیە، بەڵکو هی میرنیشینە عەرەبەکانی باکوری عێراقە!

لەگەڵ ئەوەشدا نابێت جیاوازیی بنەمایی نێوان گوتاری خۆبەعەرەبکردنی کورد و کوردناسیی بەعسییەکانمان لەبیر بچێت، (کە دەتوانین بە گەڕانەوەی گوتاری بەعەرەبکردنی دوایش ناوی ببەین). ئەو جیاوازییەش لەوەدایە کە کورد دەیەوێت لە ڕێگەی قەبووڵکردنی پرۆسەی خۆ بەعەرەبکردنەوە، مانەوەی خۆی دەستەبەر بکات و جۆرێ لە شانازی بەدەست بهێنێت. لەکاتێکدا گوتاری کوردناسیی بەعسییەکان، زەمینە خۆشدەکات بۆ سەندنەوەی هەموو شانازییەک لە کورد و ڕێگا خۆشدەکات بۆ سڕینەوەی گشت شوێنەوارە مادیی و مەعنەویەکانی ئەم میللەتە. ئەو

ئەنجامـــەی لـــە بەراووردکـــردنی ئـــەم دوو گوتـــارەوە (خۆبەعەرەبکردن و کوردناسیی بەعس) بەدەستی دەهێنین ئەوەیە: یەکەمیان لە چوارچێوەیەکی سۆزگەرایی ئایینیدا دەمێنێـــتەوە و دووەمیشـــیان پـــرۆژەیەکی عەقڵانـــیانەی وێـــرانکەرە. بۆیـــە پێویســـتە لـــە بەعسناســـیی کـــوردا، دەستبەرداری ئەو وێنە باوە ببین کە بەدرێژایی شەڕی ڕزگاریخوازی و لە ڕاگەیاندنی حیزبەکانەوە، بەعسییەکانی وەک مرۆڤی «ناعەقڵانی» پێناسە کردووە.

کوردناسیی بەعسییەکان پرۆژەیەکی عەقڵانیانەیە کە ئیشیکردووە بۆ شێواندنی مێژوو، بەسیاسیکردنی ئایین و بەخشینی کاراکتەرێکی ڕەگەزپەرستانەی تۆتالیتاریانە بە ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە تێڕوانینیاندا بۆ مەسەلەی کورد. لە ئاستی جوگرافیشدا هەمیشە جوگرافیای دەوڵەتی عێراقی وەک «بەشێکی جیانەکراوە لە نیشتیمانی گەورەی عەرەب» پێناســە کـــردووە و لـــەم ڕێگەیەشـــەوە کاریکـــردووە بـــۆ ڕەتکـــردنەوەی هـــەموو فرەیـــیەک لـــە عێـــراقدا، بـــەبێ لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندییە ئەتنیکیەکان و هەموویانی لە ژێر ناوی «گەلی عێراق/الشعب العراقي»دا ڕاپێچکردووە[٩٠].

بۆیە کوردناسی بەعسییەکان هیچ کامێک لەو ڕێسایانەی بەســەردا پراکتـیزە ناکرێـت کـە (تزفیـتان تـۆدۆرۆف) بـۆ ناسینی (ئەویتر) باسیان دەکات. چونکە ئەو کوردناسییە لە

[90] صدام حسين: *حول كتابة التاريخ*. ص ١٨.

بنەمادا بۆ ناسین نیە، هێندەی ئەوەی بۆ لەناو بردنی کوردە وەک دووژمنێک.

تۆدۆرۆف سێ پانتایی یان سێ ئاست بۆ توێژینەوە لە ئەویتر، یان «ئەویترناسی مەعریفی» دیاری دەکات کە ئەمانەن:

یەکەم: ئاستی بەها ناسی (ئەویتر باشە یان خراپە؟).

دووەم ئاستی ڕەفتارناسی (ئایا بەهاکانی ئەویتر قەبووڵ دەکرێن؟ ئەویتر وەک خۆمان وایە؟ یاخود دەبێ خۆمانی لێ بەدوور بگرین؟)

سێیەم: ئاستی مەعریفی (ئایا تا چەندە شارەزایین بە ئەویتر، یان تا چەندە نەزانین بەرامبەر بە ئەویتر؟)[91].

هەروەکو پێشتر نوسیم: کوردناسیی بەعسیەکان لەسەر بنەمای مەعریفەیەکی شەڕانیەوە بەرامبەر بەکورد بەرهەمهاتووە، نەک مەعریفەیەکی ئاڵوگۆڕکەر. لەناو ئەو مەعریفە شەڕانیەشدا «کورد» هەرگیز وەک بوێکی سەربەخۆ و خاوەن ئازادیی قسەی خۆی، وێنە نەکراوە، بەڵکو هەمیشە «بەئەویتر کراوە» بۆئەوەی دواجار «بەدوژمن بکرێ» و لەم ڕێگەیەشەوە پرۆژەی لەناو بردنی سیستەماتیکیانەی بەشێوەیەکی عەقڵانی و بە تازەترین ئەو چەکە کۆکوژیانەی دەوڵەتانی وەک ڕووسیا دەیاندایە جێبەجێ بکرێت. لە شەڕیشدا لەگەڵ ئێران (١٩٨٠-١٩٨٨)

[91] مهرزاد بروجردی: *روشنفکران ایرانی و غرب*. ل ١٦.

ئەمەریکاش پشتگیریی لێکرد و لە نزیکەوە هاتە مەیدانەوە.

بە بۆچوونی من لە کوردناسیی بەعسدا، سێ قۆناغ هەیە کە تیایدا بەعسییەکان، بە پشتبەستن بە تێگەیشتنێکی بەعسیانە بۆ ئەو کولتوورە عەرەبییەی تیایدا وێنای کورد کراوە، کورد بەئەویتر دەکەن؛ تا بتوانێت دواجار بیخاتە خانەی دووژمنەوە. ئەو سێ قۆناغەش ئەمانەن:

**یەکەم قۆناغ:** کورد وەک بابەتێک «ئۆبژە» بۆئەوەی بەعسییەکان ئیعترافی لێوە بەدەست بهێنن بۆ گەورەکردنی «من»ی عەرەبیانەی خۆیان. ئا لێرەدا ئیسلامی بەرای ئیلهامبەخشی بەعسییەکانە: هەردووکیان ئەویتر ناچار دەکەن تا شایەتمانیان پێ بهێنێ و بەمەش بچووکیی خۆیان لە ئاست «من»ی عەرەبیی ئیسلامییدا، ڕابگەیەنن. دەکرێ بەم قۆناغە بگوترێ قۆناغی خۆگونجاندنی دوای گرژییەکان. لەم قۆناغەدا بەعس پرۆسەی بەبەعسیکردن دەستپێدەکات و بەعسییەت دەبێتە ئینتیمای یەکەم لە عێراقدا، هەروەکچۆن لەسەردەمی فتوحاتدا ئینتیمای یەکەم لەڕێگەی شایەتمانهێنانەوە بوو. ئەمە ئەو قۆناغەیە کە بەعسییەکان دەیانەوێت سنووری نێوان «ئێمە» و «ئەوان» شەففاف و

ڕوون ببێتەوە و کەس نەمێنێت لەدەرەوەی سنوورەکە بێت"[92].

**دووەم قۆناغ**: ئەو قۆناغەیە کە تیایدا کورد وەک«ئەویتر» مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت؛ کە بەعس پێویستی پێیەتی بۆ دڵنیابونەوە لەگەورەیی خۆی. لەم قوناغەدا (من)ی گەورەی بەعس جۆری لە ماف دەداتە کورد و سیمایەکی «بەخشندەئاسا» بۆخۆی دروستدەکات و دەیەوێ لە سەقامگیریی ناسنامەی خۆی دڵنیا بێتەوە و ململانێ ناوەکییەکان کپ بکاتەوە. دەکرێ بەم قۆناغە بگوترێ «*قۆناغی خۆڕازیکردنی بەعس سەبارەت بە کورد*» وەک ئەو قۆناغەی کە تیایدا ڕەزامەندیی لەسەر بەیاننامەی یازدەی ئازاری (١٩٧٠) دەربڕی.

**سێهەم قۆناغ**: بەڵام لەقۆناغی خۆ ڕازیکردنی بەعسدا، «ئەویتر»، کە کوردە، ڕازیی نابێت و بەردەوامە لەململانێکردن بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی خۆی و ئەگەری ترسناکبوونی زیاتر دەبێت. بۆیە بەعس جارێکی دی ناسنامەی خۆی لە ئاست گروپێکی گەورەی ناوخۆییدا، لە قەیراندا دەبینێت و ئەمجا لە سیاسەتی خۆیدا، کورد لە قۆناغی «بەئەویترکردنەوە» دەگوێزێتەوە بۆ قۆناغی «بەدووژمنکردن»: دووژمنێک کە دەبێت بەهەموو شێوەیەک

---

[92] ئاراس فەتاح: *هەشت قۆناغ لە سیستمێکی کوشتن و سڕینەوەدا*.
سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١ و پاشتر.

لــەناو ببریــت، چــونکە ئیــتر بۆتــە ئەگەریــکی ترســناک.
گرنگــترین پــرۆژەکانی بــەعس لــەم قۆناغــەدا، بریــتین لــە:
ڕاگواســـتنی زۆرەملـــەی گوندەکـــان، دەرکـــرنی کـــوردە
فەیلــیەکان، ئــەنفالی بارزانیــیەکان، کارەســاتی هەڵەبجــە و
ئەنفالــەکانی دواتــر... ئــەوەی جێگــەی ســەرنجە لەم قوناغەدا
بــەعس، کــورد نــەک هــەر وەک دووژمــنی عەرەبایــەتی وێــنا
دەکــات و بانگهێشــتنی ڕۆڵەکانی نەتەوەی عەرەبی دەکات بۆ
بەشــدار بــوون لــە پاکتاوکردنــیاندا، بــەڵکو وەک دووژمــنی
خــوداش دەیخاتــە بــەردەم شــاڵاوەکانی «ئــەنفال» و بەمــەش
شەڕێکی پیروز لەدژی بەرپا دەکات . شەڕێک کە داوا دەکات
ڕۆڵــە مســـوڵمانەکانی عـــەرەب بەشـــداری تێـــدا بکـــەن و
هەرەیەکــەیان ببــنەوە بــە محەمــەدێکی تر، وەکنەوەی عەفلەق
ئاواتی دەخواست.

## پێنجەم: بۆ ببمەوە بە عێراقی؟!

پـــرۆژەی بەعەرەبکـــردن و خۆبەعەرەبکـــردن و دواجـــار پرۆژەی کوردناسیی بەعسییەکان میراتێکی تراژیدیانەیان بۆ بەجێهێشـــتووین: یەکەمـــیان لەســـەر دەســـتەمۆکردن و دووەمـــیان لەســـەر خۆفەرامۆشـــی و سێهەمیشـــیان لەســـەر سڕینەوەی خـودی کـوردی ئیشـیانکردووە. ئەوەی یەکەمیان کـوردی وەک نێچیرێـک بینـیوە کە ویستویەتی ماڵیی بکات و بـۆ ئەمـەش هـاتووە قەفەسێکی ئاسنینی بۆ دروستکردووە و هەوڵـیداوە بـیخاتە سـەر ئەو بڕوایەی کە بەرژەوەندییەکانی لەوەدایـە بچێـتە نـاو ئـەو قەفەسـەوە چـونکە تەنـیا لەوێـدا بەرژەوەندیـەکانی دەپارێزرێن و مانەوەی دەستەبەر دەبێت. دووەمـــیان بـــە تێـــپەڕینی کـــات ئـــەو بانگهێشـــتنەی قەبوڵکـردووە و چۆتە نـاو قەفەسـەکەوە. سێهەمیشـیان بە سـوود وەرگـرتن لـە پـرۆژەی یەکـەم (بەعەرەبکـردن)؛ دوای شێـواندن و دابڕکـردنی لـە هـەل و مەرجـە مێـژووییەکانی، هـــاتووە شێـــوەیەکی بەعســـیانەی ڕەگەزپەرســـتانەی پێبەخشـیوە و وەک پشـتیوانەیەکی مێـژوویی بەکاریهێـناوە بـۆ شـەرعییەتدان بـە پـرۆژەکەی خـۆی کـە بریتیـبووە لـە بەئەویترکردن و بە دوژمنکردنی کورد.

ئەگـــەر پـــڕۆژەی یەکـــەم، واتـــە بەعەرەبکـــردن، لـــە چوارچێـــوەی پانتایـــیەکی سیاســـی - ئایـــینی (فـــتوحات و بەئیسلامکردن)دا ئەنجامدرابێت؛ ئەگەر خۆبەعەرەبکردنیش زیاتـر لەسـەر بونـیادی دەروونـیی و مەعـنەوی لاوازکـراوی کورد بەئەنجام گەیشتبێت و کوردیش لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا هاتبێتە سـەر ئـەو بڕوایەی کە ژیانی ناو قەفەسە ئاسنینەکە وەک «حەقـیقەت»ی ژیـان پەسـەند بکـات؛ ئـەوە پـڕۆژەی سێـــهەم بەســـوودوەرگرتن و شێـــواندن و ســـەرلەنوێ دارشـــتنەوەی ئـــەو دووانـــەی یەکـــەم، توانـــیویەتی «بەئەویـــترکردن» و «بەدوژمـــنکردن» و ســـڕینەوە لەســـەر عـــەردی واقـــیع و لـــە چوارچێـــوەی جوگرافـــیایەکدا جێبەجێبکات، کـە خـاکی «عێـراق»ـە. لێرەشـەوە ئەگـەر تـا ئێستا لـە قسەکانماندا مانایەکی مەجازیمان بۆ دەستەواژەی «قەفەسـی ئاسـنین» لەبەرچـاو گرتبێت، ئـەوە بـە دامـەزرانی دەوڵـەتی نوێـی عێـراق و لەسـەر دەسـتی ڕژێـمە یەکـبەدوای یەکـەکانی ئـــەم وڵاتـــە، بەتایبەتـــیش لەســـەر دەســـتی بەعسـییەکان؛ عێراق بۆ کورد دەبێتە قەفەسێکی ڕاستەقینەی ئاسنین کە هیچ مانایەکی مەجازیانە هەڵناگرێت.

بەعسـییەکان، هـەروەک چـۆن مانایـەکی تایبەتـیان بـە ئیسـلام و کولـتوری عـەرەبی بەخشـی و بـە گوتـەی سـەدام حسێـن: «تێگەیشتنێکی بەعسـیانە»یـان لەسـەر بەرهەمهێـنا؛ ئـاواش چـــەمکی دەوڵـــەتی «عێـــراق»یـــان لـــە ناوێـــکی جوگرافیـــیەوە، کـــە ئـــەویش لـــە دوای جـــەنگی یەکەمـــی

جیهانییەوە دروستکرابوو، کورد بە چەمکێکی ڕەگەزپەرستانە و بەڕاستیی کردیانە ئەو قەفەسە ئاسنینەی کە چیدی تیایدا مسوڵمانبوون و خۆبەعەرەبکردن و بەعێراقی بوون و تەنانەت قەبووڵکردنی ئۆتۆنۆمیش، وەک پرۆژەیەکی کارتۆنیانەی بەعس، شەفاعەتیان بۆ کورد نەدەکرد...

عێراق بۆ بەعسییەکان، ئەو پانتاییە جوگرافیە بوو کە جەوهەرەکەی، پێش ئەوەی شوێنێک بێت بۆ ژیانی فرەڕەنگیی ئینسانەکان و حەوانەوە و ئاسایش؛ لەوەدا بوو کە «بەشێکی جیانەکراوە بێت لە نیشتیمانی گەورەی عەرەب» و بگرە «پاسەوانی دەروازەی خۆرهەڵاتی ئەو نیشتیمانەش بێت»: «حارس البوابة الشرقية للوطن العربي».

ئالێرەشەوە بەعسییەکان عێراقیان کردە سەنگەری بۆ شەڕکردن لەگەڵ هەموو ئەو دوژمنە ڕاستەقینە و وەهمیانەی کە ڕۆژگارێک چاویان دەبڕیە ئەم جوگرافیا گەورەیەی کە ناوی نیشتیمانی عەرەب بوو. بەڵام ئەم نیشتیمانە گەورەیە بەدەست نەخۆشییەکی کوشندەوە دەیناڵاند کە ئەویش پارچەپارچەیی و نەبوونی یەکێتی نەتەوەیی بوو، بۆیە بەعسییەکان لە ئەدەبیات و میتۆدی پەروەردەییانەی خۆیاندا و بە زمانێکی تایبەت[93]،

---

[93] زمانی بەعسیانەی میشێل عەفلەق جیاوازە لە تێگەیشتنی سەدام حسێن بۆ ئەو زمانەی پێویستە لە ڕێگەیەوە بیروڕاکانی بەعس دەر

نیشتیمانەکەیان بە «خیزان»یک دەچوواند، کە دەبوو ئەندامەکانی ناوی (عەرەبەکان) ببنە سەربازیک و یەکیتی نەتەوەیی خۆیان بپاریزن، چونکە ئەوان هەڵگری پەیامیکی عەرەبیانەی نەمرن: «امة عربية واحدة، ذات رسالة خالدة»[94]

دوو دانە لەو ڕەهەندە گرنگانەی کە بەعسییەکان بەلایانەوە وا بوو یەکیتی نەتەوەیی عەرەب دابین دەکەن، چەمکی عەرەبایەتی «عروبة» و چەمکی «ئیسلام» بوون. بەڵام دەبیت ئەوە بزانین کە عەرەبایەتی بەلایانەوە لە ئیسلام کۆنتر و ڕەسەنتریش بوو، چونکە لەلایەکەوە، ئیسلام بووە هۆی ژیاندنەوە و نویکردنەوەی عەرەبایەتی[95] و لەلایەکی دیکەیشەوە، وەک میشیل عەفلەق دەیگوت: ئیسلام لە ناو نەتەوەی عەرەبدا نەبایە سەریهەڵنەدەدا و ئەمەیشی

---

بېردرین. لەلای عەفلەق زمان دەبیتە ئامرازیک کە ڕاستیەکانی ڕابردووی عەرەب بە ڕەنگ و بۆیەکی نیمچە فەلسەفی و فیکری و بەبێ بەڵگەکاری، دەگوازیتەوە بۆ نەوەی نوێ. لە کاتیکدا سەدام حسین نەفرەت لە زمانی ئیستیدلالی و فەلسەفی دەکات و پێیوایە دەبیت بیروڕاکانی بەعس بە ساکارترین شیوە، تەنانەت بۆ منداڵانی کەمتەمەنیش، بەرجەستە بکرێن. لەمبارەیەوە بڕوانە: صدام حسین: *حول كتابة التاريخ*. سەرچاوەی پیشوو، ل١٤.

[94] سەبارەت بە گرنگیی ئەم دروشمانە لە فیکری بەعسدا بگەڕیوە بۆ: حزب البعث العربي الاشتراكي، القيادة القومية: *المنهاج الثقافي المركزي*، كتاب الاول، بغداد ١٩٧٧، ص ٥٩-٦٠ و ص ٧١- ٧٨و هەروەها ص ١٧٩-١٨٢.

[95] میشیل عفلق: *في سبيل البعث*. ص ١٢٦ و بەرەو دوا

بەبەست بەو فەزیلەت و خەسڵەتانەی لە عەرەبدا نەبێت لە هیچ نەتەوەیەکی دیکەدا نین[96]. لەلای سێهەمیشەوە عروبە خەسڵەتی کەماڵ و لوتکەی پێگەیشتنە؛ کەواتە جەوهەرێکی نەگۆڕە، لە کاتێکدا ئیسلام ڕەهەندێکی *دواکەوتوانە* و ڕەهەندێکی *شۆڕشگێڕانە*یشی هەیە[97]. کەواتە لە ڕوانگەی عروبەویانەی بەعسییەکاندا ڕەهەندی شۆڕشگێڕانەی ئیسلام: «**بزاڤێکی عەرەبییە، ئەو زمانەی پێی هاتۆتە خوارەوە عەرەبییە، تێگەیشتنی ئیسلامیانە بۆ شتەکان بەچاوێکی عەرەبیانەیە و مسوڵمانیش بێجگە لە عەرەب کەسیتر نییە**»[98] جێی سەرنجە کە ئەم بزاڤە عەرەبیە هەر تەنیا ڕووداوێکی مێژوویی نیە تا «**بۆ عیبرەت وەرگرتن و شانازی پێوەکردن یادی بکرێتەوە؛ بەڵکو ئامادەییەکی هەمیشەییە لە نەتەوەی عەرەبدا** (استعداد دائم في الامة العربية)

---

[96] ئەم گوتەیەی عەفلەق لەگەڵ ئەم لێکدانەوەیەی (ئەبو حەیانی تەوحیدی) بەراوورد بکە، کە تیایدا دەڵێت عەرەب: «اعقل الامم لصحة الفطرة، واعتدال البنية، وصواب الفكر، و ذكاء الفهم». بڕوانە: رضوان السيد: *مفاهيم الجماعات في الاسلام*(دراسات في السوسيولوجيا التاريخية للاجتماع العربي الاسلامي). بيروت ١٩٩٣، ص ١٢٩. ئەویش لە: ابو حيان التوحيدي: *الامتاع والمؤانسة* ٨٩/١ وەریگرتووە.

[97] ميشيل عفلق: *في سبيل البعث*. ص ٢٠٩-٢١٧. دەبێت ئەوە بەیادی خوێنەر بهێنمەوە کە هەڵوێستی عەفلەق سەبارەت بە ئایینی ئیسلام لە نێوان ساڵانی ١٩٤٣ بۆ ١٩٥٦ گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

[98] ميشيل عفلق: *في سبيل البعث*. ل ١٢٧

ـ ئەگەر لە ئیسلام بەوجۆرە تێگەیشت کە لە حەقیقەتی خۆیدا هەیە»[99]. بێگومان حەقیقەتی ئیسلام بە تێگەیشتنێکی بەعسیانەی ڕەگەزپەرستانە و لە ئەنجامی سیاسیاریکردنیەوە، وەکئەوەی پێشتر قسانمان لەبارەوە کرد.

بەرهەمهێنانی تێگەیشتنێکی بەعسیانە لەسەر عێراق، کاری بەردەوامی زیاتر لە سی و پێنجساڵی بەعسییەکان بووە. ئەگەرچی ئەوان زۆر پێشتر کاریانکردووە بۆ ڕەگەزپەرستانەکردنی ئیسلام و کولتووری نەتەوەی عەرەب و بەئایدیۆلۆژیکردنی عروبە. ئەو سی و پێنج ساڵەی بەعسییەکان لە عێراقدا حوکمیانکرد، زۆر بە وردی کاریانکرد بۆ گەڵاڵەکردن و بەرجەستەکردنی تێگەیشتنێکی بەعسیانە لە بیرکردنەوەی گرووپێکی کۆمەڵایەتی گەورەی ناوەوە و دەرەوەی جوگرافیای ئەم وڵاتەدا و هەوڵیاندا چەمکی «عێراق» لە پانتاییەکی جوگرافی ـ ژیاریی ـ ژینگەییەوە بگوێزنەوە بۆ پانتاییەکی سیاسیی دەمارگیرانەی شەڕخواز. کارکردنی بەعسییەکان کارکردن بوو بۆ بەرهەمهێنانی مرۆڤێکی پەروەردەکراو، کە بتوانێت بەعسیانە بیر لە چەمکەکانی وەک «یەکێتی عەرەب،

---

[99] میشیل عفلق: *في سبيل البعث*.ل ١٢٥

نەتەوەی عەرەب، نیشتیمانی عەرەب، عێراق، گەل...» بکاتەوە[100]

بەلایکەمەوە نەوەیەک، یان بابڵێین گرووپێکی گەورە لە هاوولاتیانی ولاتانی عەرەبیی دی، بەم تێگەیشتنە کاریگەر بوون و نەوەیەک لە هاوولاتیانی عێراقیش، لەناو ئابڵۆقەیەکی پەروەردەیییانەی بەعسییەکاندا چاویانکردەوەو بەشێکی زۆری ئەو چەمکانە لە زەینی ئەواندا و لە تەمەنێکی زووی منداڵییەوە، بەو مانایانە بەرجەستەبوون کە بەعس پێی بەخشیبوون. واتە هەمان چاویلکەی بەعسیان کرایە چاوو هەر بەو چاویلکەیەش ئەو چەمکانە دەخوێننەوە. واتە هەمان مانایان بۆ یەکێتی خاکی عەرەب و نیشتیمانی عەرەب و پیرۆزیی شوێنگەی عێراق و مێژووی نەتەوەی عەرەب هەیە، کە بەعسییەکان بە پێی خەسڵەتەکانی ڕێبازە تایبەتییەکەی خۆیان بەرهەمیان هێنابۆوە. ئەو ڕێبازەش وەک سەدام حسێن دەڵێت: **«ڕێبازێکی تەحلیلیانەی مێژوو بوو نەک گێڕانەوەی ڕووداوەکان. تا ئەو تەحلیلکردنە بتوانێت هەمان ئەو خەسڵەتانە بداتە مێژوو، کە لە تیۆرەی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستیدا هەن»**[101]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت

[100] صدام حسین: *حول كتابة التاريخ*. ص ١٤-١٥.
[101] صدام حسین: *حول كتابة التاريخ*. ص ٢٣.

کە بەعس فریای ئەوە کەوت دزە بکاتە ناو «هابیتۆس»[102]ی گرووپێکی گەورە لە مرۆڤی عێراقی و عەرەبییەوە و ئەو شوێنە لە کەسایەتی ئەوان داگیر بکات، کە تیایدا جیهابینی و خوو و ڕەفتار و توانای نرخاندنیان بۆ شتەکان شێوەی خۆی دەگرێت. ئێستا ئەو گرووپە گەورەیە، کە تەمەنی بەگشتی لە نێوان بیست بۆ سی و پێنج ساڵدایە، هەمان گرووپە کە ڕای گشتی عەرەبی پێکدەهێنێت و لە کاتی لێدانی هاوپەیمانەکاندا و بە پشتیوانیکردنی ڕژێمی بەعس، ڕژایە

---

[102] ***هابیتۆس*** زاراوەیەکی کۆمەڵناسی فەرەنسی (پیر بۆردیۆ)یە. بەو بونیادە زەینی و مەعریفیانە دەگوترێ، کە مرۆڤەکان بەهۆیانەوە و لە ڕێگەیانەوە ڕووبەڕووی ژیانی کۆمەڵایەتیان دەبنەوە. بە بڕوای بۆردیۆ مرۆڤەکان خاوەنی زنجیرەیەک پلان و نەخشەی زەینین، کە دەتوانن بەهۆیانەوە لە دنیای کۆمەڵایەتی خۆیان تێبگەن و بینرخێنن. ئەم بونیادە زەینییە دروستبوویەکی مێژووییە و خێزان و قوتابخانە و ژیانی کۆمەڵایەتی لە مرۆڤدا بەرجەستەی دەکەن و گەشەی پێدەدەن، بەجۆرێ کە دەبێتە بەشێک لە نائاگاییان و لە کردار و هەڵبژاردن و خوو و ڕفتارەکانیاندا بڕیار دەدات و ڕەنگدەداتەوە. بەم مانایەش هابیتۆس سیستەمێکی ڕێکخستن و گونجاندنە، کە لە نێوان بونیادە کۆمەڵایەتیەکان و کردارە پراکتیکیەکانی تاکەکەسدا ناوبژی و هاوسەنگی دروستدەکات. بەوەی کە هابیتۆس پرۆسەیەکی مێژووکرد دروستی دەکات، ئەوە بەدرەنگ دەگۆڕێت؛ وەلێ بۆگۆڕینی هابیتۆسی تاکەکان باشترین ڕێگا بریتییە لە گۆڕینی بونیادە کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکان و بارگاویکردنیان بەو نرخ و بەها و ئایدیۆلۆژیانەی کە دەوڵەت مەبەستێتی.
لەمبارەیەوە بڕوانە:
Heine Andersen(red.): Sociologi en grundbog til et fag. Hans Reitzels Forlag, Kopenhavn 1998, p 69-70

سـەر شـەقامی پایـتەختی وڵاتـە عەرەبـیەکان. ئەمـە هـەمان ئەوەیە کە ئێستا و دوای ئاشکرابوون و هەڵدانەوەی سەدان گۆڕی بە کۆمـەڵی، لـە ڕاگـەیاندنی عەرەبیدا ڕۆڵی بەرچاوی هەیـە لـە دروسـتکردنی نۆسـتالیژیای بەعسـیزمدا. ئەمـە بەشێکی هـەمان گرووپیشـە لە هاووڵاتیانی عێراقی، کە دوای ئـەو هـەموو تـراژیدیایەی بەسـەر کۆمەڵگاکـەیدا هـات، دەگەڕێـتەوە بـۆ شووناسـێکی جەنگپەرسـتانە و پشێـوی نانـەوە و شێوازە سەرەتاییەکانی بەرگریکردنی قەبیلەیی لە دەسـت و پێـوەندەکانی ڕژێـم. ئەمـە هـەمان گـرووپە لـە هەڵپەڕین بـۆ سـەدام حسێـنەوە دەگوازێتەوە بۆ لەخۆدان و شینگێڕی لەبـەردەم بەچکە ئاخوندێکدا. ئەمە هەمان ئەوەی چالاکیشـە لـە حیزبە سیاسـییە عێـراقییەکاندا، کـە تـا ئـەم سـاتەوەختە نەیتوانیوە لـە ئاست کـوردا خـۆی لە دەسەڵاتی ئـەو چـەمکانە ڕزگـار بکـات کە پێشتر باسمکردن و لێوانلێون بـەو مانایانـەی بـەعس پێی بەخشیون. ئەمـە بەشێکی هەمان جـەماوەری عەرەبییـە کـە بـە بینینی لاشەی کوڕەکانی سەدام هەسـتیاریی عـروبەویانەی دەخرۆشێـت وکەچـی لـە ئاسـت هەڵدانــەوەی گـۆڕە بەکۆمەڵیـیەکانی بـرا عـەرەب و هـاو دینەکانـیاندا ئـەو هەسـتیاریە لـە خـەوێـکی قـووڵ، یـان لـە بێدەنگییەکی ڕەهادایە.

لـە ڕاسـتیدا ئـەم ئەوەیـە لـە دوای داگیرکـردنی کوێـتەوە ئەوەیـەک بـووە ئابڵۆقـەی ئـابووری و ڕۆشـنبیریی سـەختی لەسـەر بـووەو بـەدوور بـووە لـە هـەموو زانیاریـیەک، کـە

پەیوەندیان بە گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە و دنیاوە هەبووە. ئەمە جگەلەوەی مەحرووم بووە لە هەموو جۆرەکانی تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن و پەیوەندیکردن و ئاڵوگۆڕی هاوچەرخ. ئەگەر ئیمکانیشی بۆ رەخسا بێت ئەو تەکنەلۆژیایە بەکار بهێنێ، لەژێر کۆنترۆڵ و سانسۆرێکی رەسمیی توندا بووە و ڕاگەیاندنی مەرکەزیی ڕژێم بڕیاریداوە هاووڵاتیان چی ببینن و چی نەبینن. ئەمە بێجگە لە نەبوونی ڕۆژنامەگەریی ئازاد و پرۆژەی ڕاگەیاندنی ئەهلی. وێڕای ئەمەش بەعس نەک هەر گوێی لە تەلەفۆنی ماڵان و کەسەکان دەگرت، بەڵکو پۆستخانەکانیشی کردبووە درێژکراوەی دەزگای سیخووڕی و هەواڵگری، تەنانەت پۆستخانە لە عێراقدا ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە ئاشکراکردنی پەیوەندیی هاووڵاتیانی عێراق بە کەسوکاریان لە دەرەوە و کەم پەنابەری عێراقی هەیە، باج و گومرگ و بەخشیشی بۆ کارمەندە سەختگیرەکانی پۆستخانە، لەگەڵ ئەو دیاری و دەرمان و پێویستیانەدا نەناردبێت، کە دەیناردنەوە بۆ خێزانەکەی خۆی.

جگە لە شەڕە بەردەوامەکانی لە کوردستاندا، ئەم نەوەیە ڕاپێچی سێ جەنگی یەکبەدوای یەکیش کرا: جەنگی عێراق/ئێران(١٩٨٠-١٩٨٨)، داگیرکردنی کوێت(١٩٩٠) و دواجار شکانی هەمیشەیی لەسەر دەستی هاوپەیمانەکان (٢٠٠٣). لەگەڵ دەستپێکردنی هەریەک لەم جەنگانەدا، دەزگاکانی پڕوپاگەندەی بەعس بە خستنەگەڕی گوتاری

عـروبەویانەی ئیسـلامیانە، بـە پیبەخشـینی وینـەی دزیـو بـە دووژمـنە واقـیعی و وەهمییەکان و ناوبردنی ئەو جەنگانە بە (قـەعقاع) و (قادسـیە) و شـەڕی یـەمان) و (کوفـر) و شـەڕی (نەتـەوەی عـەرەب) و (فورسـی مـەجووس) و (سەهیۆنیەت) و هـتد؛ مـرۆڤی عێـراقییان پڕدەکـرد لـە ئومێـدی سـاختەی سـەرکەوتن و بـردنەوە و هەسـتکردن بـە بـالآخوازی و شـەهامەت. لەکاتێکدا ئەم مرۆڤە لە دۆڕاندن و سەرکوتانەوە و کـوژران زیاترهیچـی دیکـەی لـەو جەنگانـەدا بـە نسـیب نـەدەبوو. بۆیـە شتێکی ئاسـاییە ئـەو ئەوەیە لە چاوەڕوانیی هـاتنی ئـەو سـەرکەوتنانە و خۆبینیـنەوەی لـەناو واقـیعی دۆڕانـەکاندا، گرێـیەکی دەروونیی سەختی بۆ دروستبوو‌بێت، کـە ئێـمە نیشـانەکانی ئـەو گرێـیە لـەو حـەزە زۆرەیـدا بـۆ تۆڵەکـردنەوە و تالآنکـاری و خۆوێـرانکاردندا دەبیـنین. تەنانـەت ئـەم مـرۆڤە ئەوەندە هەست بە تێکشکان دەکات، کە دوای ڕووخـانی ڕژێم و دەزگاکانیشی، کە چیدی ناتوانن هیچ مژدەیـەکی پێبەخشـن؛ سـووتاندنی ماشێنێـکی سـەربازە ئەمەریکیـەکان بـە بـردنەوە دادەنێت و بەدیاریانەوە سەمای سەرکەوتن دەکات...

هـەموو ئـەم نموونانـەو چـەندان نموونـەی دی پێماندەڵێـن: بـەعس لـە عێـراقدا جـۆرێ لـە مـرۆڤی پەروەردەکـردووە کـە هابیتۆسـەکەی ڕێگەی پێنادات بە ئاسانی دەست لە ڕابردووی هەڵبگرێـت و هـەموو ئـەو چـەمک و وەسـفیات و سیسـتەمە زاراوەیـیە تـەلاق بـدات، کـە بـەعس لـە بیرکـردنەوەیدا

بەرجەستەی کردووە و ناچاری کردووە بەهۆیانەوە «تێگەشتنێکی بەغسیانە» لەسەر دنیا بەرهەم بهێنن. دروستکردنی ئەو نەوەیە و پەروەردەکردنی ئەو هابیتۆسە و دواجار جێهێشتنی لە «عێراقی دەروازەی خۆرهەڵاتی نیشتیمانی عەرەبی»دا، نەک هەر یەکێک بووە لە پرۆژە درێژخایەنەکانی بەعس، بەڵکو یەکێکیشە لە دوایین موفاجەئەکانی، کە ماوەی بەدیارکەوتن و ئاشکرابوونی لەسەر عەردی واقیع؛ کەمتر نابێت لەو ماوەیەی پرۆسەی دروستبوونە ئایدیۆلۆژییەکەی خایاندوویەتی. بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە گەر وابزانین کۆتایی ڕژێمی بەعس لە عێراقدا کۆتایی بەعسیزمە و پرۆژەی لەبەعسخستنیش دەمانگەیەنێت بەو کۆتاییە، وەک هەندێ کەس بۆی دەچن.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە گوتاری بەعێراقیکردنەوەی کوردستان، لە ئێستادا و دوای دابڕانێکی دوازدە ساڵیی مرۆڤی بەشێکی زۆری کوردستان لە حوکمی ڕاستەوخۆی بەعس؛ دەمانخاتە بەردەم چاوپۆشیکردن لەو مێژووەی کە بەعسییەکان بۆ عێراقیان بەرهەمهێنا و دەمانخاتە بەردەم فەرامۆشکردنی ئەو هابیتۆسەی بەعس لە مرۆڤی عێراقیدا خەملاندی. ئەم گوتارە نەک هەر دەرفەتێکی ئیجابی ناخاتە بەردەمی کورد، بەڵکو ناچاریشی دەکات دەست لە هەموو ئەو دەستکەوتانەش هەڵبگرێت کە بەدابڕانی ئەم هەرێمە لە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بەعس،

بوونە دەستکەوتی نەوەیەک، کە زۆر جیاوازە لەو نەوەیەی بەعس پەروەردەی دەکردن.

بەمجۆرەش جیاوازییەکی زەینی و میزاجی و مینتالی و کولتووری لە نێوان ئەو نەوەیە و هاوتەمەنی ئەو نەوەیە لە کوردستاندا، دروستبووە؛ کەهەندێ هەلومەرجی بابەتی لە دروستکردنی ئەو جیاوازیەدا ڕۆڵیان هەبووە. یەکێک لەو هەلومەرجانە ئەوەیە کە لە ڕاپەڕینەوە مرۆڤی ناو کۆمەڵگای کوردی زیاتر لە کەشێکی بەجیهانیبووندا ژیاوە لەچاو نەوەی ژێر دەسەڵاتی بەعس. لەئاستی سیاسی و بازرگانیشدا پەیوەندی هەرێمی کوردستان بە دنیای دەرەوە زیاتر بووە و ئەمەش ڕەنگدانەوەی خۆی هەبووە لەسەر زەینی ئەندامانی کۆمەڵگا. بوارەکانی ئاڵوگۆڕ و ڕاگەیاندنی ئازاد و نیمچە ئازاد و ئەهلی و بزاڤە ڕۆشنبیریەکان، توانیویانە بەشێک لە چەپێنراوەکانی مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایە لەبەرامبەر دەسەڵاتی سیاسەت ئایین و نەریتەکاندا ئازاد بکەن. ئامرازەکانی پەیوەندیکردنی ئەلکترۆنی و تەکنەلۆژیا بە ڕێژەیەکی نیسبی، لەچاو عێراقی ناوەند و خواروو، لە کوردستاندا بلاوتر بوون. کۆمەڵگای کوردی لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆتردا بووە لەگەڵ کۆمەڵگا ئەورووپاییەکان و لەمەشدا هاتوچۆی بەردەوامی تاراوگەکراوەکان و پەنابەرەکان؛ بەجۆرێ لەجۆرەکان ڕۆڵی خۆی بینیوە لە گواستنەوەی ڕەهەندە کولتووریەکاندا. بەتایبەتیش ئەو ڕەهەندانەی پەیوەندیان

هەیە بە زەوق و سەلیقە و ئارایشی ژیانی ڕۆژانەوە. بەکورتی، وێڕای کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵگای کوردی، هەڕەشەی بەردەوامی ڕژێمەکانی دراوسێ، ململانێی ناشەرعی حیزبایەتی و شەڕی ناوخۆ و بیرۆکراتیەتی ئیداری و زیندووبوونەوەی شێوازەکانی پەیوەندی عەشایەری و توندڕەوی ئایینی(تیزابرێژی و ئافرەتکوشتن و...)، هێشتا کۆمەڵگای کوردی بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵگایەکی ئارامتر بووە و مەجرای ژیانی ئاسایی لەبەردەوامیدا بووە. لەناو ئەم هەلومەرجانەشدا نەوەیەکی چاوکراوەتر گەشەی کردووە کەنەک هەر بروایەکی زیاتری بەخۆی هەیە، بەڵکو تەنانەت گرێ دەروونیەکانیشی جیاوازن لە گرێی دەروونی هاوتەمەنەکانی خۆی لە عێراقی بەعسدا. بۆنمونە ئەم نەوەیە تێگەیشتنێکی تەواو جیاوازی بۆ چەمکی تۆڵەکردنەوە لە بەعسییەکان هەیە، لەچاو ڕۆژانی ڕاپەڕیندا: لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا، ئەو نەوەیەی ئێستا لە کوردستاندا تەمەنی لە نێوان بیست و پێنج بۆ چل ساڵە، بڕوایەکی تەقلیدیانەی هەبوو بە تۆڵەکردنەوە لە بەعسییەکان، کە ئەویش تۆڵەکردنەوە بوو بە کوشتن. کەچی لە دوای داتەپینی ڕژێم لەسەر دەستی هاوپەیمانەکان، وەکئەوەی لە چەندین دانیشتندا کە بۆمەبەستی هەڵوێست وەرگرتن بوون لە بەعسییەکان، داوای ***سزای یاسایی*** بۆ دەستەندەخۆر و تاوانبارەکانی سەر بە ڕژێم دەکرد. ئەمەش لەکاتێکدا کە هەندێک لەو تاوانبارانە ڕوویان

کردبۆوە کوردستان. بەهەمان شێوە، ئەگەرچی ئەم گرووپە گەورەیەی کۆمەڵگای کوردی گلەیی و ڕەخنە و ناڕەزایی خۆی هەیە لە هێزی هاوپەیمانەکان و چیدی بەچاوی فریادڕەس تەماشایان ناکات؛ کەچی بەرگریی ئەم گرووپە کۆمەلایەتیە لە خۆپیشاندانی هێمنانە و بەرزکردنەوەی داخوازی و دانوستانی مەدەنیانە زیاتر لە ئاست هێزی ناوبراو، تێپەڕی نەکردووە.

هەموو ئەمانە پێماندەڵێن، تێکەڵکردنەوەی ئەم دوو کولتوور و مێنتاڵیتە جیاوازە، لەناو عێراقێکی یەکگرتوودا، (کە یەکگرتوویەکەی لە بنەڕتدا میراتی ئایدیۆلۆژیای بەعسیە ڕەگەزپەرستەکانە؛ یا لەئێستادا لەڕووی سیاسی - ئیدارییەوە هەر پێناسەیەکی دیکەی بۆ بکرێت)، کارێکە خزمەت بە ئاسایشیی کۆمەلایەتی داهاتوو ناکات.

گوتاری بە عێراقیکردنەوەی کوردستان، هەڵقولاوی بیروڕایەکی پتەوبێت بە یەکپارچەیی خاکی عێراق، وەکئەوەی حیزبە عێراقیەکان دەخوازن؛ یان تاکتیکێکی حیزبە کوردیەکان بێت بۆ قایمکردنی پێگەی خۆیان لە ئیدارەی داهاتووی عێراقدا، زیاتر لەوەی گوتارێک بێت بۆ پێکەوە ژیان و لەگەڵ یەکدا هەڵکردن، گوتارێکی تۆتالیتاریانە و لە بالاوە سەپاوە و هیچ بنەمایەکی واقیعیانەی لەناو کۆمەڵگای پەرتەوازەبووی ئەم ولاتەدا نیە. تۆتالیتاریانەیە، چونکە ئەو پێناسەیە لەبەرچاو ناگرێت کە بەعس لە ماوەی حوکمی خۆیدا بە عێراقی بەخشی و

بریتیبوو لە دابڕنەکردنی عێراق لە نیشتیمانی گەورەی عەرەبی. ئەمەش هەمان تێگەیشتنە کە حیزبە عەرەبیە عێراقیەکان بڕوایان پێیەتی و پڕۆژەی بەعەرەبکردنی بەرایمان بیر دەخاتەوە. ئەم گوتارە لەبالایشەوە دەسەپێنرێت، چونکە ناهێلێت «من»ی کوردی خۆی بێت و لە خۆیدا بێت، بەڵکو ناچاری دەکات ببێتە ئەویتر و بۆ ئەویتر بێت. ئەمەش جۆرێکی دیکەی پڕۆژەی و خۆبەعەرەبکردنی بەرایمان بیر دەخاتەوە، بەتایبەتی کاتێک دەبینین و دەبیستین ئەوانەی بانگەواز بۆ بەعێراقیکردنەوەی کوردستان دەکەن، لە هەمان ئەو چین و توێژە دەسەلاتدارەن، کە لە کۆندا خۆبەعەرەبکردنیان وەک تاقە ڕێگا چارەیەک دەبینی.

## بیماریی هەتا مردن...

گوتـاری بەعەرەبکـردنی بـەرایی و خۆبەعەرەبکـردن لـە ئێسـتای ژیـانی ئێـمەدا زیـندوون و تەنـیا دیاریـیەکی دەستیشـیان هـەمان قەفەسە ئاسنینەکەیە؛ وەلێ بەناوێکی تر و لـە ژێـر زەبری هـەلومەرجێکی دیکەدا. لەم پێوەندیگەیشەوە بەعێراقیکردنەوەی کوردستان، بەخشینی ئازناوێکە بە کورد کـە ناتوانێـت مانـای کوردبوونەکـەی فراوانـبکات. بـەڵکو بچووکی دەکاتـەوە تـا سنووری ڕەتکردنەوە و تواندنەوەی. لـە مێژووی عێراقیشـدا هەمیشـە **عێـراقیبوون** بـۆ کـورد ئـەو ناسـنامە سەپێنراوە بـووە کـە خـودی کـوردی شـاردۆتەوە و بەتاڵـیکردۆتەوە لـەوەی وەک خۆی بێت و ئەمەش بۆتە هۆی ئـەوەی کـە شوناسێکی دیکـە قەبووڵ بکات کە شوناسی خۆی نـیە. عێـراقیبوون شوناسێـکە بۆکـورد لەسـەر حسـابی سـڕینەوەی شوناسـی ڕاسـتەقینەی کـوردی و ئەمـەش بۆتـە هـۆی بـە قوربانیکردنی خودی مرۆڤی کورد بۆ ئەو ئازناوەی پێیدراوە.

لـە پـڕۆژەی خۆبەعەرەبکـردنی بەرایـیدا بینـیمان مێژوونووسـە کوردەکـان لەژێـر کاریگـەریی پـڕۆژەی بەعەرەبکـردندا، ڕەچـەڵەکی خۆیـان و بـنەماڵە و خـاوەن دەسـەڵاتە کوردەکانـیان دەبـردەوە سـەر عـەرەب و

دەیانویست وەک عەرەب بن و لە هەمان کاتیشدا مێژووی کوردیان دەنووسییەوە. لە خۆبەعێراقیکردنەوەی نوێشدا کە پڕۆژەیەکی سیاسەتمەدارە کوردەکانە، خەبات بۆ وەدەستهێنانی داهاتووی میللەتی کورد دەکرێ وەک عێراقی و لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوودا تا وەک ئەوانیتر بێت. ئەم دوو پڕۆژەیە چەندە لە ڕووی زەمەنییەوە لێکدیەوە دوورن، کەچی هەردووکیان بەدەست ناکۆکیەکی دەروونییەوە دەناڵێنن و هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی تەماهی و لێکچوون لە نێوانیاندا دروست ببێت و ئێمە بتوانین بەهۆیانەوە باس لە بەردەوامیی بەکۆیلەبوونی «من»ی کوردی لەناو مێژوودا بکەین. ئەمە جگە لەوەی هەردووکیان لەناو ئەو بازنەیەدا دەسووڕێنەوە کە ئەویتر بەدەوری کوردا کێشاویەتی و سنووری ئازادیەکانی بۆ دەستنیشنکردووە.

ئەو ناکۆکیە دەروونییەی کە شەرم و خۆنەفیکردنەوەیەکی بەردەوامی مێژوویی بەرهەمیهێناوە ئەوەیە: دەستەی یەکەمیان کە مێژوونووسەکانن، مێژووی کورد دەنووسنەوە دوایەوەی ڕەچەڵەکی ئەم کائینەیان دەبردەوە سەر غەیرە کورد. لەکاتێکدا دەستەی دووەمیان شوناسی کوردبوون لەژێر زەبری شوناسێکی تردا دەشارنەوە کە تیایدا «من»ی کوردی پێناسەیەکی نیە جگە لە عێراقیبوون. سەبارەت بە دەستەی یەکەم پرسیارەکە ئەوەیە، *چۆن دەکرێ مێژوو بۆ میللەتێک بنووسرێتەوە کە*

*تیایدا ئینکاری ڕەچەڵەکەکەی بکەین؟* ئەگەر نووسینەوەی مێژوو بریتیبێت لەبەرجەستەکردنی ئەو کردارانەی میللەتێک لە ڕێگەیانەوە شوناسی خۆی دروستکردووە، **ئایا دەکرێ مێژووی میللەتێک بنوسینەوە کە خودی ئەو میللەتە وەک بکەری مێژووەکەی نەفیکەینەوە؟**

سەبارەت بە دەستەی دووەمیش پرسیار ئەوەیە، *چۆن دەکرێ بوونی میللەتێک بسەلمێنین و بەرجەستەی بکەین، لە کاتێکدا شوناسی یەکەمی ئەو میللەتە لە شوناسێکی کوردییەوە دەگۆڕین بۆ شوناسێکی عێراقیانە* و ناوەکەی دەگۆڕین بۆ نازناوێک کە خودی ئەم نازناوە پێ ئیزافەکراوێکی نێگەتیڤە و لە نەفیکردنەوەی شوناسی یەکەم زیاتر هیچ ئیزافەیەکی ناخاتە سەر؟

لەهەردوو ئەم گوتارەدا هونەرێک ئامادەیە کە هونەری *ڕەتکردنەوەی خود* و هونەری ئینکارکردنی خودە وەک خودێکی سەربەخۆی جیاواز لە هەر شوناسێک کە پێیدەبەخشرێت. هەردوو ئەم گوتارانە لەسەر پرنسیپێک کار دەکەن کە پرنسیپی «بەخودنەبوون»ی کوردە و لەهەردووکیاندا کوردبوون «بابەتێکە» بۆ نەفیکردنەوە. لەهەردووکیاندا خودبوونی کوردی دەکرێتە ئەو شتەی کە خۆی نیە و ئەمەش ئەو جۆرەیە لە بوون کە تیایدا مرۆڤ وەک ئەوەی کە خۆی هەیە، ئینکاری خۆی دەکات. لەوشوێنەشدا کە خود ئینکاری خۆی دەکات، پەیوەندییەکی خراپ لەگەڵ خۆیدا بەرهەمدەهێنێ و نایەوێت خۆی بێت.

ئالێرەدایە کە خود سەربەخۆیی و ئازادیی خۆی ڕەتدەکاتەوە و لەو کاتەشدا کە ئەمە دەکات، خۆی دەدۆڕێنێ، چونکە وەک کیاکەگۆرد دەڵێت: *«خۆبیوون ئازادییە»*[103]. خۆدۆڕاندن واتە خود ئایەوێت وەکئەوەی کە لە خۆیدا هەیە ئازاد بێت و ئەمەش وادەکات خود نەتوانێت بەئازادی لەگەڵ خۆیدا لە پەیوەندیدا بێت، بۆیە دەبێتە خودێکی نائازاد و کۆیلە[104]. خودی کۆیلەش هەموو شتێکە جگە لە خۆی و ئەمەش ئەو نەخۆشییە کە دەکرێ لەسەر زمانی فەیلەسووف پێی بگوترێ *«بیماریی هەتا مردن»*[105]، بیمارییەک کە [illegible] ببینە ئەوەی کە خۆمان هەین و ببینە ئەوەی کە لە خۆمانمان دابڕ دەکات و لێرەشەوە خۆمان وەدیهێنەری مەرگی خۆمان ببین، بەڵام ئەو کائینە چییە کە نایەوێت خۆی بێت وەکئەوەی کە هەیە؟ بێگومان ئەمە ئەو کائینەیە کە هەموو شتێکی ترە جگە لە خۆی، جگە لە حەقیقەتی خۆی، جگە لە خودی ڕاستەقینەی خۆی، لە شوناسی خۆی. بەڵام شوناسی ڕاستەقینەی خۆی چییە جگە لەوەی خۆی وەکو کائینێکی ئازاد و سەربەخۆ و جیاواز قەبووڵ بکات؟ ئەمەیە ئەو شوناسەی کە لەئەنجامی

---

[103] Arne Gron: Subjektivitet og negetivitet. Gyldendal, 1994 p. 9

[104] Arne Gron: begrebet angst hos Soren Kirkegaard. Filosofi. Gyldendal, 1993, p. 111.

[105] ناوی کتێبێکی فەیلەسووفی دانمارکی( سۆرن کیاکەگۆرد)ە: ( Sygdommen til doden

ئەو کردارانەی دەیانکات و لە میانەیاندا ناسنامەی خۆی تازە دەکاتەوە؛ ناهێڵێت خۆی بدۆڕێنێت. ناهێڵێت خۆی لەبیر بکات و خۆی نەفی بکاتەوە لە پێناوی ئەوەی وەک ئەوانیتر بێت و ئەوانیتر لەخۆی ڕازیی بکات و لە قەفەسە ئاسنینەکە نەیەتە دەرەوە. قەفەسە ئاسنینەکە بۆ ئەو خودە نائازاد و دۆڕاوە بۆتەماڵێکی خۆش، بەبێ ئەوەی بزانێت یان بیری بێت کە ئەو ماڵە خۆشە لەهەر ساتێکدا بۆی هەیە ببێتە دۆزەخ. لە ڕاستیشدا لەهەر شوێنێ خود وەک ئەوەی کە لەخۆی تێدەگات و ڕێز لەخۆی دەگرێت وەک ئەوەی لە خۆیدا هەست بە گەورەیی دەکات، ڕێزی لێنەگیرا و ناچارکرا شتێکی دیکە بێت جگە لەوەی بۆخۆی دەیخوازێت؛ ئەوە با ئەو شوێنە بەهەشتیش بێت؛ وەلێ خود وەک دۆزەخێک تەماشای دەکا.. عێراق بۆ کورد، بۆ ئەوەی نوێ، کە دەیەوێت ڕێزی لێبگیرێت وەکئەوەی لە خۆیدا هەیە، جگە لە قەفەسێکی ئاسنین چیدیکە نیە. وەلێ خۆشبەختانە هەروەک چۆن پرۆژەی خۆبەعەرەبکردنی بەرایی زیاتر لەوەی دیاردەیەکی گشتگرەوە بێت بۆ کۆمەڵگای ئەوسای کورد، دیاردەیەکی تایبەت بوو بە گرووپی دەسەڵاتدارە کوردەکان؛ ئاواش پرۆسەی خۆبەعێراقیکردنەوە دیاردەیەکی سەراپاگیری کۆمەڵگای کوردستانی، نیە. ڕاستە ئەم دوو دیاردەیە هەردووکیان دەلالەت لە بیماریی ویژدانی دەستەیەکی هەڵبژاردەی کۆمەڵگای ئێمە دەکەن، وەلێ بەوەدا کە خۆبەعێراقیکردنەوە هەم جۆرێکی تری

خۆبەعەرەبکردنەوەی نوێیە و هەم قەفەسە ئاسنینەکەمان بیر دەخاتەوە؛ ئەوە بیمارییەکی کوشندە ترە. تەنیا شتێک خۆشحاڵمان دەکات ئەو بەرگریکردنە جەماوەرییەیە کە نایەوێت بچێتەوە ناو قەفەسە ئاسنینەکە و لێناگەڕێت کەسیش بەزۆر بەرەو ئەوێی ڕاپێچ بکات...

ئیتر کاتی ئەوە هاتووە هەرکەسە ناونیشانی خۆی بە تەواوی بنوسێت تا نامەی هەڵەی بۆ نەیەت و نامەکانی بۆ شوێنی هەڵە نەبرێن:

ناونیشانی من:

کوردستان، هەولێرە ماست، گەڕەکی ڕاپەڕین، بەرامبەر قوتابخانەی شەنگەبێری کچان، ماڵێکی شین، لە دەرگا بدە و:

*لێم مەپرسە من کێم، ئەنفال ڕابردووی سڕیمەوە،*
*لێم مەپرسە لە کوێم، ئەنفال لە خۆمی بزریم،*
*من لە ئێستادام، ڕەنگە لە ئێستادا بم،*
*لە ئێستادا بپەیڤم، لە ئێستادا بەردەوام بم، دەستپێکەمەوە؛*
*جگە لە خۆم، چ عەردێ شک نابەم تیا بژیم و تیا بمرم.*

٤-٦-٢٠٠٣

٤-٨-٢٠٠٣

## سەرچاوەکان بە پێی بەکارهێنانیان لەم باسەدا:


- Den engeliske patient, Lindhardt og Ringhof, 1997
- ئارشاک پۆلادیان: کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا. وەرگێرانی: ئازاد عوبێد ساڵح. چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ۲۰۰۰.
- المسعودی: التنبیه والاشراف، بیروت -۱۹۸۱.
- عبدالرحمن شرفکندی«هەژار» (وەرگێر): *لورلسانی بیروز*. ناشرین: انتشارات تازه نگاه، نشر احسان، تهران.
- رضوان السید: *مفاهیم الجماعات في الاسلام*(دراسات في السوسیولوجیا التاریخیة للاجتماع العربي الاسلامي). بیروت ۱۹۹۳
- مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی: (وەرگێڕان و ساخکردنەوە): *ولاتگیری ڕەشەخاکی عێراق* «فتوح سواد العراق» ، چ ۱، سلێمانی ۱۹۹۷.
- حکیم احمد مام بکر: الکرد و بلادهم عند البلدانیین و الرحالة المسلمین (۲۳۲-۶۲۶هـ/۸٤۶-۱۲۲۹م)، رسالة دکتوراه، جامعة صلاح الدین، اربیل ۲۰۰۳م.
- د. عبدالله ابراهیم: المرکزیة الاسلامیة، صورة الاخر في المخیال الاسلامي خلال القرون الوسطی. المرکز الثقافي العربي، بیروت۲۰۰۱.

- ناتین دولابوتی: سیاست اطاعت(رسالەای درباره بردگی اختیاری. ت. علي معنوی. تهران نشر نی، ۱۳۷۸.
- *یاداشتەکانی مەئموون بەگ کوڕی بێگە بەگ*. وەرگێڕانی: سەلاح نەقشبەندی، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی ۲۰۰۲.
- واسیلی نکیتین: کورد و کوردستان. وەرگێڕانی هێدی، هەولێر ۱۹۹۸.
- ابن واصل: مفرج الكروب في اخبار بني ايوب. قاهرة ۱۹۵۳.
- الامير شرف خان البدليسي: شرفنامة. ت. محمد جميل الملااحمد الروزبياني. مؤسسة موكرياني للطباعة و النشر ۲۰۰۱، كردستان/ اربيل.
- مەلا مەحمود بایەزیدی: داب و نەریتی کوردەکان. وەرگێڕانی د. شکریە رسول، ۱۹۸۲، بەغدا.
- ی. ئی. ڤاسیلیەڤا: «کتێبێکی نەدۆزراوە دەربارەی مێژووی کوردستان». وەرگێڕ: عەبدوڵا مەردۆخ.گۆڤاری ڕەهەند، ژ. ۱۹۹۹/۸.
- عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان: ڕەوشی کوردان. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: کەریمی حیسامی، ۱۹۹۱، ستۆکهۆلم.
- مێجەر نۆئیل: یاداشتەکانی مێجەر نۆئیل لە کوردستاندا. وەرگێڕانی: حسێن ئەحمەد جاف، حسێن ع. نێرگسەجاڕی بەغدا، ۱۹۸٤.
- مەلا عبدالکریم مدرس: یادی مەردان. بەرگی یەکەم، ۱۹۷۹و بەرگی دووەم، ۱۹۸۳، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد. بەغدا.

- مارتین وان برووین سن(راستیەکەی: مارتین ڤاون برونسن): جامعەشناسی مردم کرد(اغا، شیخ و دولت) ساختارهای اجتماعی و سیاسی کردستان. ت: ابراهیم یونسی، ۱۳۷۹، تهران. نشر پانیز.
- صورة الاخر: العربي ناظرا و منظورا اليه: تحرير: طاهر لبيب. مركز دراسات الوحدة العربية، ۱۹۹۹، بيروت.
- ڕێبوار سیوەیلی: نەتەوە و حەکایەت. سپیریز، کوردستان/ دهۆک ۲۰۰۳.
- بارنز و بکر: تاریخ اندیشه اجتماعی. از جامعه ابتدایی تا جامعه جدید. ت. ج. یوسفیان و علی ا. مجیدی. جلد اول، تهران، ۱۳۵۸.
- ڕێبوار سیوەیلی: (ئامادەکار) مێژووی هەزری کۆمەڵایەتی. زنجیرەی هەزر و کۆمەڵ ژ.(۲)، ۲۰۰۳، هەولێر.
- Politikns Forlag: Nudanskordbog I. 13udgave, 2 oplag 1987, P. 84.
- مهرزاد بروجردی: روشنفکران ایرانی و غرب. ت. ج. شیرازی. تهران ۱۳۷۸.
- حزب البعث العربي الاشتراكي، القيادة القومية: المنهاج الثقافي المركزي، كتاب الاول، بغداد ۱۹۷۷.
- نص مشروع دستور جمهورية العراقية. دار الثورة للصحافة و النشر، دون سنة الطبع.
-Heine Andersen(red.): Sociologi en grundbog til et fag. Hans Reitzels Forlag, Kopenhavn 1998, p 69-70
- شاراس فەتاح: "هەشت قۆناغ لە سیستمێکی کوشتن و سڕ بۆچوون"، گۆڤاری ڕەهەند ژ. ۷، ۱۹۹۹.

- صدام حسين: حول كتابة التاريخ. دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٩.
- ميشيل عفلق: في سبيل البعث. دار الطليعة، بيروت ط. الحادية عشر، ١٩٧٤.
- د. ناجي معروف: عروبة العلماء المنسوبين الي البلدان الاعجمية في بلاد الروم و الجزيرة و شهرزور و اذربايجان. الجمهورية العراقية، وزارة الثقافة، دار الحرية للطباعة ١٩٧٨ ج ٣.
- Arne Gron: Subjektivitet og negetivitet. Gyldendal, 1994 p. 9.
- Arne Gron: begrebet angst hos Soren Kirkegaard. Filosofi. Gyldendal, 1993

عەرەبە مسوڵمانەکانی سەرەتا دەیانگوت
کوردەکان بەڕەچەڵەک عەرەبن، پاشان
مێژوونووسە کوردەکان ڕەچەڵەکی
خۆیان و بنەماڵە کوردەکانیان دەبردەوە
سەر عەرەب و شانازیشیان بەمەوە
دەکرد . ئەم دوو گوتارە لە ئێستاشدا
بەردەوامن، بەڵام بەشێوازێکی ترو دیاری
دەستیشیان قەفەسێکی ئاسنین بووە کە
تیایدا کورد، جگە لەنێچیرێکی دەستەمۆکراو
هیچی تر نەبووە .

بەعێراقیکردنەوەی کوردستانیش درێژکراوەی
هەمان پرۆژەیە، چونکە عێراقیبوون بۆ کورد
شوناسێکە لەسەر حسابی شوناسی ڕاستەقینەی
خۆیی و جۆرێکی تری دەستەمۆکردنی ئەم
میللەتەیە تا ژیان لەناو قەفەسە ئاسنینەکەدا
وەک ژیانێکی ((ڕاستەقینە)) قبوڵ بکات.